ناڤێ پەرتوکێ: بەرسڤا گومانێ بێ دینیێ
نڤیسین و ئامادەکرن: کۆمەکا گەنجێن بادینان
رێکخست و پێداچوون: فیصل رسول، جاسم هاشم
دیزاینکرنا بەرگی: محمد ریبەر
سال: ٢٠١٩

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بسم الله الرحمن الرحيم ........

دەستپیك:

سالا ٢٠١٦ بوو گەنجەك بووم كو موسلمان بووم من حەش ئیسلامێ دكر و كەسەكی هند پێگر نەبووم ب ئیسلامێ، بەلێ من هەر حەش ئیسلامێ دكر دبیت تشتەكی فیتری بیتن یانژی هەر ژبەر هندێ بیت كو مالباتا مە موسلمان بووبیت و ویراسی بیتن، گەهشتم سالا ٢٠١٦ ئەم دناڤ تۆرێن جڤاكی بووین بیتاییەت فیسبوكێ جارەكی كەسەكی ئەز داخلی ناڤ گروپەكی كرم من تشتێ زێدە سەیردیت كو پێكدهاتن ژ بێدین و زەردەشتی و مەسیحی و هەتا جوهی ژی تێدابین، دگەل واناژی موسلمان هەبین، دەستپێكێ من حەش ڤان تشتاكر و شەڤ و رۆژ من چاڤدێریا ڤان گروپا دكر و دیڤچوون بۆ بابەتا دكر، كەسین زیرەك تێدابین، بەلێ جار جار ژی ئیمانا من یا وەهمی دلەرزاند و دكەتم ژێر كاریگەریا گومانێت وانا لێ ئەز دیڤ بابەتا دچووم و راستی بۆمن دیاردبوو، كو ئەز قورتال دكرم ژ الحادێ، هەرزی دناڤ وانادا من دەستكر ب بەرسڤ دانا ڤان گومانا دگەل هەبوونا كێم و كاسیا، بەلێ هەر من هەولددا باشتر ببم، سال و نیڤا زێدەتر ئەڤە كارێ من بوو، پاشی من هەستكر ئەڤ تشتە كێمە دناڤ بادینان و كێم كەس بەرسڤا بێدینا ددەن، كو ئەوێ من دنیاسی دناڤ وان گروپا كەسەگ بوو بناڤێ بەتار دهۆكی، زێدە زیرەك بوو و دیڤچوون بۆ بابەتا دكر، پاشی كەسەك من دناڤ بادینان نیاسی بناڤێ جاسم هاشم كو خودانێ كەسایەتیەك بهیز و لۆژیكیە و وی بریاردا دگەل من بیت ل هەمی خۆشی و

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

نەخوشیا و کەسەك دی مە داخاز ژێکر هاریکاربیت کو بناڤێ هارون خالید بوو، وی گەلەك هاریکاریا مەکر هەرچەندە شارزایەکا وسا نەبوو لڤی بواری لێ بۆ رێڤەبرنا کاروبارا زێدە هاریکاربوو .

مە گروپەك دروستکر هەروسا پەیجەك ژی راستی دەست پێکێ زێدە زەحمەت بو چونکی لناڤ بادینان تشتەکێ نوو بوو ئەڤ بابەتە، لێ مە هەست پێدکر ئەڤ ڤایرۆسە دێ گەهیت بادینان دڤێت خوە بۆ بەرهەڤ بکەین و ئامادەبین، د ماوێ نزیکی سالەکێ الحمدلله ئارمانجا خوە ب زێدژی ڤە بدەست بینین و بەرسڤاپرانیا پرسیارێ وانا بدەین و نەهێلین ئەو کۆنترۆلا بادینان بکەن، الحمدلله چەندین کەسایەتییێ بهێز و گەنجێن خەمخۆر هاتنە ناڤ ڤی بواری و تشتەك بۆ بێدینا نەما، ژبەر هندێ من بریاردا ڤان بەرسڤا بکەمە پەرتوکەك دا خەلکەك مفای ژێ ببینیت و سوپاسیا هەمی وان کەسا دکەم یێ هاریکار بووی دگەل مە .

فیصل رسول مجید

ئاکرێ/ ٢٠١٩/٥/٥

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

**ئیلحاد چیە:**

پێکدهێت ژ انحراف کرنێ ژ رێکا راست، کو لدیڤ پێناسا وانا پێکدهێت ژ انکاریا هەبوونا خودای، ئەوژی ژ چەند جۆرا پێکدهێن ژوان

Atheist ملحد:

کو ئەون یێ انکارا هەبوونا خودای دکەن و هەبوونا خودای رەتدکەن، یانژی هەبوونا خودای ب ئەگەرەکێ کێم ددانێن

Agnostic لاادری ( نزانم ):

ئەڤ جۆرە راوستایە ل مەسەلا هەبوونا خودای هوسا دبینیت بەلگێت لسەر هەبوون و نەبوونا وی باورپیکەر نینە .

Diest الربوبي :

ئەڤ جۆرەی باوری یا هەی ب هەبوونا خودای لێ وسا هزردکەت کو خودای گەردوون یی چێکری پاشی یێ هێلای

Irreligions الاديني:

ئەڤ جۆرە هەمی ئاینان رەتدکەتن ودبیت ملحد بیت یان ربوبی بیت یانژی لا ادری بیت .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤە بكورتی جۆرێن وانایە مە نەڤێت ب شێوەییێكی گشتی بەحسبكەین و بدەینە نیاسین ئارمانجا مە لڤێره تنێ بەرسڤدانا هندەك گومانایە لسەر ئیسلامێ كو ژلایێ وانڤە دهینە بەحسكرن و دگەل هندەك بەرسڤێن دی بۆ كەسانین دی .

## ئەرێ عائیشایێ شیرێ سنگێ خو ددا زەلامەکی؟!

دوژمنێت ئیسلامێ ب جەهل و نەزانینا خو دبێژن عائیشایێ شیر ددا زەلامەکی! و دەلیلێ وانا ئەڤ حەدیثە یە د صەحیحا بوخاری دا :

٤٨١٤ حدثنا أبو الوليد حدثنا شعبة عن الأشعث عن أبيه عن مسروق عن عائشة رضي الله عنها أن النبي صلى الله عليه وسلم دخل عليها وعندها رجل فكأنه تغير وجهه كأنه كره ذلك فقالت إنه أخي فقال انظرن من إخوانكن فإنما الرضاعة من المجاعة

پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - هاتە مالا عائیشایێ و دیت زەلامەك یێ لمالا وان ، بو وی نەخوش بو چونکی ئەو نە دنیاسی ، عائیشایێ زانی بو وی نەخوشە لەوما گوتێ ئەو برایێ منە ، پێغەمبەری گوتێ باشە بەلێ تەکید بکەن کانێ ژ راست برایێ تە یە چونە شیردان ب تێرکرنا برسێ یە.

وەکی هین دبینن دوژمنێت ئیسلامێ تێناگەهن و ب عەقلەکێ پیس تێدفکرن یانژی :

١- دڤێ حەدیثێ دا چ بەحسا وێ چەندێ نەکریە کو عائیشایێ شیر ددایێ!

٢- ئەو کەسە برایێ وێ بو ژ شیری ئانکو دەیکا وی کەسی شیر دابو عائیشایێ دەمێ عائیشا یا بچیك لەوما دبو برایێ وێ .. ابن حجر دبێژیت: وكأن أمه التي أرضعت عائشة عاشت بعد النبي صلى الله عليه وسلم فولدته فلهذا قيل له رضيع عائشة ( فتح الباري)

٣- بو پێغەمبەری نەخوش بو چونکی نەدزانی کو ئەو برایێ وێ یە ، و دیسلامێ دا حەرامە کەسێ نە مەحرەم سەرەدا ژنکا بکەت .

٤- عائیشایێ زاروك نەبون و شیر نەبو ما دا ئەوا شیرى دەتێ ئەگەر ژ راست ژى هوسا با!

لەوما گەلى خوشك و برايا بزانن گومانێتدوژمنێت ئیسلامێ هەمى درەو و خەلەت تێگەهشتنە و پچەكێ مروڤ لديڤ بچیت دێ زانیت كو ئەو درەوا دكن..

/https://ulkurd.wordpress.com/2017/07/02/shir

**ئەرێ ڕاستە قورئان پێغەمبەر محمد نڤێسیە - علیه السلام .**

ئەرێ محمد - علیه السلام - دزانی بخۆینیت ؟! ئایە چەوا محمد پێغەمبەر - علیه السلام - ئەڤ زانست و تەكنەلۆجیایە زانی كۆ د وەختكێدا ئەو ل بیابانێدا ؟!

ئەمێن دبینین بەهراپتریا ئەواێن كۆ بۆینە مولحد باوەرى یا ب زانست و تەكنەلۆجیایێ هەى كۆ ئەڤەژى ژ نیشانێن نەخۆێندەوارى یێ یە چونكە قورئان بەرى ١٤ سەدە بۆمە بەحسێ زانست و تەكنەلۆجیایێ یێ كرى ،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بێژە ئەڤە ١٤٠٠ ساڵە ، ئایا ئەگەر ڕاستە پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ ئەڤ قورئانە ژنیک خۆ ئینابیت و نە ل نیک خودایێ مەزن هاتبیت چەوا پێغەمبەر محمدی ـ علیه السلام ـ ئەڤ تشتە دزانین ل سەحرایەکا تاری و بێ کەهرەب و تەکنۆلۆجی ، بلا کەسەکێ مولحید و بێ باوەڕ بهێت بۆمە بسەلمینیت چەوا پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ ئەڤ هەمی تشتە ل سەحرایەکا تاری دزانین ئەگەر خودایەکێ بۆ نەگۆتبیت ، دێ نۆکە ب چەند خالەکا دەست پێکەین:

١ــ ئایا پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ ل کیڤە تاقیگەهەکا کیمیای هەبۆ تاکۆ بچیتە دتاقیکرنێ ڤە تاقیکرنێ ل سەر لەشێ مێریێ بکەت تا بزانیت کۆ پێکهاتا لەشێ مێوی یێ ژ ( exoskeleton ) پێک دهێت کۆ ئەڤە ژی ژ ماددەیەکێ ڕەقە و دشکێت .

یان ژی چەوا دزانی دێ مێویەکا مۆنث ئانکۆ یا ژ تۆخمێ مێ زیرەڤانی و حەرەسی و پاسەوانی یێ ل بەردەروکێن خۆ و دەوروبەران کەتن، خودایێ مەزن دبێژیت : (حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِي النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ) [النمل: ١٨]

٢ــ ئایا پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ لکیڤە ئامیرێ تەڵسکوپێ هەبوو تاکۆ بزانیت کا ستێرەک ل ئەسمانان هەیە دەنگەکێ دکەت وەک لێدان ب پارچە تەختەیەکی و ل وەختێ شەڤێدا دهێت

( وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ * النَّجْمُ الثَّاقِبُ)

الطارق ١ ـ ٢ ـ ٣

٣ــ خۆ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ ئامیرێ سۆنەرێ نەبوو پا چەوا زانی درۆست بۆنا گۆڕپەلەی ل ناڤ مالبچۆیکێ ژنکێ بەحس بکەت و وەسفێن قۆناغێن وێ بێژیت ؟!

{ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ} المؤمنون (١٤)

٤ــ خۆ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ ل سەردەمێ وی چ تەیارە و پەڕەشۆت نەبۆن تا بچیتە ئاسمانان بزانیت کۆ ل دەمێ بلندبۆن بەرەڤ ئاسمانان مروڤ تۆشی بێهن تەنگیێ و تەنگە نەفەسێ دبیت. {فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ} الانعام (١٢٥) .

٥ــ خۆ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ چ ئامیرێن گەردونناسی و گەردوون ناسا نەبوو ؟! چەوا زانی عەسمان بەردەوام یێ بەرەف فرەهیێ دچیت بەردەوام هەسارە یێ ژ ئێک دوور دکەڤن {وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ} الذاريات (٤٧)

٦ــ خۆ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ تاقیگەها فیزیایێ نەبوو تاکۆ بزانیت ئاڤ گۆڕی بگریت دێ پەقیت ب ئەگەرێ لێک جودابۆنا ئۆکسجین و هایدرۆجینێ د ئێک چرکەدا جۆدابین ل دەریایێ هنگێ دێ دەریا گۆڕی(شاهرن) و دێ پەقن {وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ} التكوير (٦)

٧ـ چەوا پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ زانی کۆ عەسمان و عەرد بەری هنگێ ئێک پارچە بۆن پاشانێ لێک هاتنە جۆداکرن ب پەقینەکێ ، لێ نۆکە زانستی یا بۆمە سەلماندی کۆ دەسپێکێ عەرد و ئەسمان پێکڤەبۆن لێ ب ئەگەرێ پەقینا مەزن یێن لێک جۆدابۆین ،

{أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ} الانبياء (٣٠)

٨ـ ئەرێ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ چەوا زانی کۆ ژبلی ڕۆژێ و هەیڤێ چەندین ڕۆژ و هەیڤێن دی یێن هەین

{وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُون} فصلتَ (٣٧)

لینکەکەی لە خوارەوە دانراوە

٩ـ ئەرێ پێغەمبەر محمد ـ علیه السلام ـ چەوا زانی کۆ هەیڤ ل ڕێڕەوێ خۆیێ دیارکری دەرناچیت و ل یاسایێ لا نادەت تازە زانایایێن گەهشتینە ڤێ ڕاستییێ بەلێ قورئان بەری ١٤٠٠ سالا بۆمە بەحسێ ڤی زانستێ گەردوونی یێ کری.

{مُّظْلِمُونَ.وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ.} یس

١٠ــ خۆ پێغەمبەر محمد ـ عليه السلام ـ پەنجە مۆر نەبوو تا كۆ بزانیت مۆرا تبلا چ كەسەكی ژ یا كەسەكێ دی ناچیت. {بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ} القيامه (٤)

ژێدەر:

١ــ مێرویێ

{ *- ئەڤە ئێک ژ مەزنتەترین شارێ مێرویا یە

https://www.youtube.com/watch?v=lFg21x2sj-M

*- دەنگێ مێرویێ

https://www.youtube.com/watch?v=QBE74Yr12aE

*- مالا مێرویێ

https://www.youtube.com/watch?v=2FeyFWSJIsU

*- پێکهاتا لەشێ مێرویێ

https://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%86%D9%85%D9%84

{http://www.sehha.com/world/index.php?showtopic=2965

٢ـــ ستێرا طارق

* – https://youtu.be/Jh5GOxgtm60

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

* ٢ـ https://youtu.be/1J4unlKMHYY

*ـ https://youtu.be/c0Ks8xuwKcY

*ـ د. عبدالدائم الكحيل

https://youtu.be/Dou0_nscV7g

٣ـ درست بوونا كۆرپەلەی

https://youtu.be/N5nDATehosc

٤ـ بلندبۆن بەرەف عەسمانی

https://youtu.be/9RG7y8-Jmak

٥ـ فرەهبۆنا گەردوونی

https://youtu.be/AS-_RYTKtXw

٦ـ گڕ گرتن و پەقینا دەریایێ

*https://youtu.be/y0md_jrKxpM

سەحكە ڤان دوو لینكێن خارێ ب جوانتر و وزحتر ببینە

* https://youtu.be/ILJfeyIq1OM

* https://youtu.be/YK8ou8vtbJw

٧ـ پەقینا مەزن

https://youtu.be/406mBRvrP6Q

٨ -- هەبوونا چەندین ڕوژ و هەیڤان

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

* https://youtu.be/HHaD2DbBG3k

* https://www.google.iq/url...

٩ـ جهـ و ڕێڕەوێ ڕۆژێ

* https://youtu.be/bptekqwaZt4

* https://youtu.be/LIPg2QonRCM

١٠ـ پەنجە مۆر

https://youtu.be/UC8kUPZEHAI

## ئەرێ ناڤێ الله ژ اللات هاتیە وەرگرتن کوو سەنەمەک بیە:

دژە ئیسلام رەخنێ دگرن دبێژت ناڤێ ( الله ) ژ (اللات ) یێ هاتیە ڤەگوهاستن کوو سەنەمەکێ قورەیشیا بیە . بۆ بەرسڤدانا ڤێ شوبهێ دەست پێکێ بزانین لات لسەر چ هاتیە گۆتن ؟ دبێژن لات یێ هاتیە وەرگرتن ژ کا چەوا تشتەک شەری ل تشتەکی دیر دئێخیتن ( لاتە یلیتە ) . دبێژن ب رامانا لولکرنا تشتەکی دهێت ( لوت الشئ ) و دبێژن ناڤێ مێینیەیا ( لات ) یە وە هیرۆدۆتی مێژوو نڤیسی رۆمانی کوو ژ سالا ٤٠٠ بەری زاینی یێ ژیای دبێژیت : ئەڤ خودایێ اللات دگۆتی الیتا انکو گولا ئاسمانی .

اللات ژ لایێ عەرەباژی سەنەمەک بیە ژلای ( ثقیف ) یێ هاتیە پەرستن و خەلکی عیبادەتا وی دکر ، دبێژن کەسەک بیە لسەر بەردەکی روون و شیر یێ فرۆشتی ب حاجیا ئەوێ سەردانا مەککەهێ دکرد ل وەختێ خۆ . و دبێژن للات ژ ( یلیت السویق للحجاج ) یەعنی کەسەک بیە گەنم و جۆ و دەخ ل ودان دقوتا وی دکرە هەڤیر ودگەل کونجیا تێکهەل دکرد و دبرژاند لسەر بەردەکی دفرۆشتە حاجیا و ئەو بەرد ب لات هاتبوو ناسین . چونکی وی ئەڤ کارە دکرد دەمێ ئەو کەسە مرد تەرمێ وی دیار نەبوو یان نەبیە و عمر بن لحی گۆتە خەلکێ وێرێ ئەڤە نە مردیە یێ چوویە ناڤ ڤی بەردی ( ئەو بەردێ هاتبوو ناسین ب لات ) ژ هنگی ڤە خەلکی عیبادەتا وی دکرد .

و دبێژن ( لات ) خودایێ مێینە بیە ل ئاسمانی وەکی مە لسەری بەحس کری کوو هیرودوتی یێ بەحس کری ژ دەمێ کۆچکرنا خەلکێ سوریێ ئەڤ ناڤە یێ هاتی ، ب هەر حالەکی ئەڤ ناڤە یێ ل ( لات السویق ) یەعنی شێلانا هەڤیری ، وسا دیار دبیت کوو کەسەکێ باش یێ بۆ حەجیا چێکری دەمێ حاجی دچوون حەجێ و بۆ طائف .

ئەڤی نان یێ بۆ دروست کری و دبێژن ناڤێ وی صرمت بن غنم بیە ژبەر کارێ وی ناڤ یێ هاتیە لێنان ب لات ژ زمانێ عەرەبیژی هەر تشتەک بهێتە ناسین یان ناسراڤ بیت دبێژنێ ( ال التعریف ) ی دێچیتە سەر و ( لات ) دێ بیتە ( اللات ) شەدە دێ چیتە سەر لامێ یەعنی ئەو کەسێ هەڤیر شێلای .

ئەگەر بەحسێ لایەنێ زمانەڤانی ژی بکەین وە هەمیا انتەرنێت و کۆمپیتەر یێ ژبەر دەستی دانە کەرەمکەن بگەرێن هەمی جها بزانن مەعنایا اللات یان لات چیە و دێ هەوە چ دەست کەڤیتن ؟ پشت راست بە چ دەستە ناکڤیت ژ وشا ( لت ) یەعنی شێلانا هەڤیری ( لت السویق یلتە لتا ) و دیڤ بچن بۆ وشا الله بزانن دێ چ دەست وە کەڤیتن .

بڤی نەوعی ژ لایێ زمانەڤانی ئەڤ گومانە هەلدوەشێتن چونکی شێلانا هەڤیری و ( الله ) کو رامانا خودایە گەلەک ژێک جیاوازن و چ جارا نەشێن الله و اللات بینە رێزا ئێک چونکی شێلانا هەڤیری گەلەک دیرە ژ خودایێ ژ هەمیێ ئاینیێ ئاسمانی .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هین هەمی هەرن سەحکەنە قورئانی پەیڤا ( الله ) ٢٦٦٩ جارا یا هاتی ل ١٨٤٢ ئایەتا . ئەگر ناڤێ الله ژ اللات هاتبا کافرێ قورەیشیا نەدشیان ئیسلامێ هەلبوەشینن و بێژن هین الله دپەرست ئەو یێ مەیە وە یێ بری ؟ و پەیڤا الله پەیڤەک نیە یا نهێنی بیت و کافر نەزانن کا چیە و چ جارا موسلمان بکاربینن بەلکوو رۆژانە سەدەها جارا ناڤێ الله دئین و بانگەشە کافرا دکر باوریێ بهینن ب الله ....... کافرێ قورەیشیا یێ جاهل و نەزان بی . وانا نەدزانی بێژنە پێغمبەری ( صل الله علیه وسلم ) اللات ناڤێ خودایێ مەیە و تە یێ بری و یێ گهۆری بۆ الله بۆچی دێ دیڤ الله ەڤم دوای اللات بکەڤم .

بڤی نەوعی دا شێن ئاینی ئیسلامێ بەتال کەنەڤە .. بەلێ کافرێ نوکە یێ زانایە وی دڤێ ناڤێ الله بۆمە شلۆڤە بکەتن و بێژیت ژ اللات یێ هاتیە وەرگرتن . هەر قورئانا مەزنە بەرسڤا ئەڤان کافرێ تورەهات یێ ٢٠١٧ و کافرێ مەزنێ قورەیشیا ددەتەڤە ، ل سورەتا النجم ١٩ بۆ ٢٣ دبێژیتن

أفرأیتم اللات والعزى ومناة الثالثة الأخرى ألكم الذكر وله الأنثى تلك إذا قسمة ضیزى إن هي إلا أسماء سمیتموها أنتم وآباؤكم ما أنزل الله بها من سلطان

ئانکو هەوە لات و عوزا نەدیتینە یان هەوە نەناسیە ؟ بۆچی هین حەزدکەن هەوە کور ببن بەلێ خودایێ خۆ ب مێینە ناڤ دبەن ، مەبەست لێ ئەوە قورەیشیا دگۆتە خودایێ خۆ مێینە دگۆتە اللات خودایێ مێینە.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ژ ڤێره قورئان رەخنێ ژێ دگریت و دبێژیتێ ( اللات ) بۆچی ب مێینه ناڤ دبەن ژ دەمەکی هین بخۆ دزانن اللات بەرده و نه نێره نه مێ هین دبێژن خودای مێییه ، د؟هەمان دەمدا هین حەزدکەن هەووه کور هەبن وکچێ خۆز دهاڤێژن چالا بەلێ هین رازینه خودایێ هەووه یێ ژ بەردی کوو اللات مێینه بیتن . ئەڤه کریارەکا خار و خیه ..

ئەرێ ئەم دپرسین ل ڤێره بۆچی کافرێت قورەیشیا قورئان هەلنەوەشاند و نەگۆتن ئەرێ ناڤێ الله یێ هەوه هەر اللاته مێیەکەی ئێمه هاتیه وەرگرتن دێ بۆچی رەخنا لمه گرن .

پرسیارا مه بۆ بێدین و کافرێت نوکه ئەوێ ب پەیجەکی بێدین بووی و بێ ئاگا ژ دنیایێ کا چەوا ئەو یێ سەردابری ، بێژه مه ته ئەڤ ئاحفتنه ل کیڤه ئینان ، ژێدەرەکێ مێژووی بۆمه بێژه یان کتێبەک یانژی دەلیلەکێ ئیسلامی ، ئەم رازینه توو ژناڤ دینێ دیژی بینی کوو بێژیت الله یێ ئیسلامێ یێ هاتی وەرگرتن ژ اللات سەنەمێ قورەیشان .

**فەرموودەکا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گەلەک دهێتە دووبارەکرن ل سەر زمانێ وان کەسا یێن دژایەتیا اسلامێ دکەن ،بێی کۆ هیج زانیاریەک ل سەر ئەگەرێ گۆتنا ڤێ فەرموودێ هەبیت،**

**ئەو فەرموودەیە دبێژیت،**

**((من بدل دینه فاقتلوه))رواه بخاری،**

بەرێزان دسوورەتا ال عمران دا ئایەتا

٧٢ێ خودایێ مەزن دبێژیت :وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ...

واتە،و بەشەکێ ژ ئەهل الکتابا ئانکو جوهیا گوتە ئێک و دوو ئیمانێ ب وێ بینن یا بوو ئیماندارا هاتیە خار،ئانکو ل سپێدێ ببنە موسڵمان و ئێڤاری ژ اسلامێ دەرکەڤن دا بەلکی گۆمان بوو موسڵمانا ژی چێبیت و ژ اسلامێ دەرکەڤن،

دڤێ ئایەتێ دا هندەک جوهیا ئەوێن دبێژنێ ئەهل الکتاب پیلانەک دانابوو کو ببنە موسڵمان و پاشی ژ اسلامێ دەرکەڤن،و بێژن ئاینێ اسلامێ درەوە و هیچە ،دا گۆمان بوو موسڵمانا ژی چێببیت و موسڵمان ژی ب ڤێ پیلانا دوژمنکارانە دسەردابچن و ژ اسلامێ دەرکەڤن،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤ چەندە ژی دژایەتی کرنا دینێ اسلامێ یە و هەر وەکو کارەکێ جاسوسیێ دهێتە هژمارتن

ژبەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت (من بدل دینه فاقتلوه) هەرکەسێ دینێ خۆە گهوڕی بکۆژن،دا کو پیلانا وان جوهیا سەرنەگریت و دەست ژ وێ پیلانا فێلباز و شەڕەنگێزانە بەردەن... بەلێ ئەڤ چەندا مە لسەری ئاماژە پێدای ئەگەرێ گۆتنا ڤێ فەرموودێ یە ...

پاشی دا بهێین پسیارەکێ بکەین ئەرێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن کیژان جورێ مورتەدی کۆشتیە یان؟؟

بەڕێزان ل هەمی دونیایێ بگەرن و ل هەمی دەولەتا و یاسایێن سەرباری پرسیار بکەن ئەگەر کەسەک ژ وێ دەولەتێ ڤەبیت و دوژمنکاریا دەولەتا خۆە بکەت کا دێ دەولەت وی کۆژیت

یان ژی نە؟! بوو نمونە بلا پێشمەرگەیەک ببیتە داعش وتو بەرێ خۆە بدێ کادێ چەواحکومەت

وی پێشمەرگەی کۆژیت،و مافێ دەولەتێ یە بکۆژیت ، چونکە دهێتە هژمارتن ژ خیانەتکارێن وەڵاتێ خۆە، ژبەرهندێ ئاینێ اسلامێ دین و دەولەت و ئاسایش و ئارامی یە،و نابیت و تشتەکێ مەعقول نینە کەسەک ژ اسلامێ دەرکەڤیت و دسەر هندێ ڕا دژایەتیا اسلامێ و موسڵمانا بکەت و شەڕی دگەل موسڵمانا بکەت

و موسڵمان گۆلا بدەنە کابرای!!نەخێر ئەڤ چەندە نەدادی یە و ئەگەر ئێک هەبیت بێژیت دادی یە ئەو بێگومان کەسەکێ نساخە و دڤێت چارەسەریەک بوو ئێشا وی یا دەرونی بهێتە دیتن!،

هەر وەسا چێدبیت هندەک پسیار بکەن و بێژن بەڵگە چیە کۆ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن مورتەد نەکۆشتیە؟؟ بەرسڤ، پێغەمبەری مورتەد یێ کۆشتی ،بەلێ ب دوو مەرجا !!ئێک ،موسڵمان بیت و پاشی ژ اسلامێ دەرکەت بیت ،دوو دگەل دەرکەتنا خۆە ژی ژ اسلامێ ،شەڕ دژی اسلامێ و موسڵمانا ڕاگەهاندبیت،ئەگەر ،نە،بلا ئەۆ کەسێن ڤێ چەندێ دبێژن ئێک بەڵگە بتنێ بوو مە بینن کۆ پێغەبەری سلاڤ لێ بن مورتەدێ بێ زیان!! کوشتیە؟؟؟!!

پشت راستم ... دێ بوو هندەکا ئەڤ چەندە یا سەیربیت ئەرێ چەوا مورتەدێ بێ زیان ناهێتە کۆشتن؟؟!

ئەز ژی ب بەڵگەڤە دبێژم بەرێخۆە بدەن ڤێ فەرموودێ :

٧٢١١ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّمَا المَدِينَةُ كَالكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طِيبُهَا،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤ فەرمووده باسێ زەلامەکێ دکەت کۆ بوو موسلمان بەلێ پشتی هینگێ نەخوەش بوو،و ئێکسەر مورتەد بوو، و ژ اسلامێ دەرکەت و گۆت اسلام ئەگەرە کۆ ئەز نەخۆەش بوویم،

بەلێ ئە مورتەد بوو ،بەلێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن نەگوتە صەحابا هەرن بکۆژن چونکە یێ مورتەد بووی، ڤێجا برایێ دژ ئەگەر تو چ ژ اسلامێ نەزانی هێڤیدکم خۆە تێکنەدە و بوو من باسێ دەقی بکە نەک فەتوایەکێ کۆ ابن تیمەی شیخ الاسلام یا دانای و فەتوایا وی باسێ وێ چەندێ ناکەت کۆ ئەگەر کەسەک بێژیت خلاس ئەز ژ اسلامێ دەرکەتم،دڤێت بهێتە کۆشتن نەخێر بەلکو باسێ وێ چەندێ دکەت ،کۆ ئەرکانێن(ستوین) اسلامێ..

پێنجن.....ئەگەر هات و کەسەکێ شوبهە و گۆمان بوو خەلکێ چێکر ل سەر ئێک ژ هەر پێنچ ئەرکانا (ستوینا)و گفتوگویێ ژی دگەل فایدە نەکر و هەر بەردەوام بوو ل سەر دروستکرنا شوبها ل ناڤ موسلمانا،ئەها هینگێ دڤێت حوکمێ کۆشتنێ ل سەر بهێتەدان،

بووچی؟!، چونکە ئەڤ کەسێن هوسا ژی مۆنافقن وبنڤە بنڤە دەربەی دوەشین اسلامێ و دڤێت ئەڤ جورە مروڤە نەمینن چونکە هەر ئەڤ چەندە ژی جورەکێ شەڕی یە دگەل اسلامێ دکەن.

## بۆچی پێغمبەرێ مە (صل الله علیه وسلم ) ١١ هەڤژین ئینانە ؟

وەکی رۆژانە ئەم دبینین رەخنێ دژە ئیسلامیا کوو دبێژن بۆچی پێغمبەری ئەڤ ژمارە هەڤژین ئینانە بۆچی کێمتر نەبینە ؟؟

بلا دەست پێکێ بزانین ئەرێ بۆ شەهوەتێ بوویە یان ئەگەرەکێ دی بوویە کوو ئەڤ ژمارە هەڤژینا بینیتن.

خوادایێ مەزن دبێژیتن : لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا (٥٢

لەمەودوا هێنانی ئافرەتانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نیە، یان واز هێنان لە هەندێکیان، تا هاوسەرانی تر بخەیتە جێیان، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی دەتەوێ بیانخیتە جێگەی هاوسەرانت سەرسام بیت لە ڕێك و پێکییان جگە کەنیزەك، هەمیشە و بەردەوام خوا چاودێری هەموو شتێك دەکات.

[سورة الأحزاب:٥٢]

ئەم هەمی دزانین هەتا خێزانا ئێکێ خەدیجە نەچوو بەر دلۆڤانیا خودێی پێغمبەری چ هەڤژینێ دی نەئینان و ژیێ پێغمبەری مەزن بوو پشتی مرنا خەدیجایێ ، پێغمبەری ئەو هەڤژینێ ئینای هەمیا بەری هنگی هەمیا جارەکێ یان زێدەتر شوو کردبوو تنێ خاتوو عائیشە نەبیت رازی بوونا خودێی لسەر بیتن ، ئەگەر کەسەکێ شەهوانی با ژ تەمەنێ گەنجاتییێ دا هەڤژینێ دی ئینیت نەک دەمێ ژیێ وی مەزن دبیتن و دا کچێت جان ئینیت و پتریا وان ئافرەتا ژیێ وان مەزنتر بوو ژ ژیێ پێغمبەری ، ئەگەر کەسەک با یێ شەهوانی با یان حەش ئافرەتا کردبا دا داخازیا سەرکردێت قورەیشا جێبەجێ کەتن کوو

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هاتنە دەف و گۆتێ هەر کچەکا جان تە بڤێت دێ پێشکێشی تە کەین بتنێ دەستا ل ڤی کارەی بەردە و دێ تە کەینە سەرکردێ خۆ یێ ئێکێ بەلێ ئەو رازی نەبوو.

ل ڤێرە دیاردبیت کوو وی بۆ شەهواتێ نەبووە و کەسەک نەبووە حەش ئافرەتا کربیت ژبەر هندێ ئەڤ ژمارە ئینابیت ، بەلێ ل ڤێرە پرسیار دهێتە کرن ئەگەر ئەڤە هۆکار نەبیتن باشە بۆچی ئەڤ ژمارا هەڤژینا هەبوویە ؟؟ بلا بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەینەڤە .

پێغمبەرێ خودێی دەمێ بانگەوازی دکرد بۆ پتریا زەلاما دکرد و ئەو فێری دینی دکرن و زەلام شارزای دینی دبوون ژ دەف پێغمبەری ژ هەمی بوارێت ئیسلامێ ، بەلێ ئافرەت نەدشیان فێری دینی ببن وەکی زەلاما و پێغمبەرێ خودێی نەدشیا هەمی بابەتا دگەل ئافرەتێ بەحس بکەت یان بۆوان باخڤیت وەکی چەوا بۆ زەلاما دئاخفت ، ئەم هەمی دزانین زەلام نەشێیت هەمی بابەتا دگەل ئافرەتێ گەنگەشە بکەین و وانا فێری وی بابەتی بکەین ، بتایبەتی ئەگەر کەسەکێ نزیکی ئافرەتێ نەبیتن ، ل ڤێرە چ بهێت کرن باشە ؟ دڤێت هندەک ئافرەت هەبن دینی ژ پێغبەرێ خودێی فێرببن و پتی هنگی ئەو ئافرەت بێژنە ئافرەتێت دەوروبەرێ خۆ دا شارزای هەمی بوارێت ئیسلامێ ببن بڤی شێوەی ئافرەت ژی فێری دینێ ئیسلامێ بوون ژ پێغمبەری

پێغمبەرێ خودێی ژبەر هندێ ئەڤ هەڤژینە ئینان داکوو ئەوانا فێری دینی بکەت و ئەوژی ببن ب ئافرەتێ بانگخواز و دینی بگەهینن ئافرەتێن دی و شارزای دینی ببن ئەڤە ئامانجا سەرەکی بوو کوو پێغمبەری ئەڤ ژمارا

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هەڤژینا ئینان و وەک هەمی دزانین رێژەکا زۆرا فەرموودا ژ خاتوو عائیشایێ یێ گوهـ لێ بووی کوو نوکە د کتێبێت فەرموودا هەنە ، ل ڤێرە ئافرەت بوو بانگخواز د ئیسلامێ دا .

ئەڤا من گۆتی تنێ هۆکارەک بوو دبیت هۆکارێن دیژی هەبووبن یێت کۆمەلایەتی و سیاسی بەلێ ئەڤ چەندە بەسە کوو چ گومان لسەر پێغمبەری صل الله علیه وسلم نەمینن.

**دڤێت تویێ موسلمان بزانی ...؟!**

ئەو بێرێزین ئەزمان درێژیا ل سەر خوشک و ژنا موسلمان دکەت ددەمەکێ دا مرییێن یاسایا ئەوروپی نە وا دڤیت بهێت ل سەر سەرێ وی ببیت یاسا و کار بو بکەت.

دێ دا ئەم ژی سەحکەنە هەوە چ یاسا بو ژن و خویشکین خو دڤیت لسەر هەوە بهێتە سەپاندن.

دا ژ وان ئەنجامێن دەست درێژیێ دەست پێبکەین هندەک پێزانینا وەربگرین.

- ژمارا وان ژنێنێن دهێنە کوشتن ل ئەمریکا ٤٠% هەتا ٥٠% ژ دەستێ (هەڤژین یان هەڤالێ) خو دهێنە کوشتن...!!

ژێدەر :

http://www.nij.gov/.../intimate-partner-vio.../pages/extent.aspx

- سالانە ٦٣٨ هزار ئافرەت ل ئەمریکا دهێنە تەلاق دان ئانکو ٧٨ ئافرەت د ئێک دەمژمێردا دهێنە تەلاق دان، بوا زانین بتنێ ١٦% ئەو ئافرەتێن هاتینە تەلاق دان سکالا تومار دکەن.

ژێدەرێ حکومەتا ئەمریکا :

https://www.ncjrs.gov/.../pdft.../sexualassaultvictimization.pdf

- ل وەلاتێ ئەڵمانیا زێدەتر ژ ٤٠٠،٠٠٠ ژن سوزانی هەنە و روژانە کارێ لەشفروشی دکەن و مەزنترین جهێ لەشفروشییێ ل وی وەلاتی ١٢ نهومی یە (طەبەقە) ل ئاڤاهیەکێ کۆلۆنیا ......

هێرمان مولەر سەروکێ ڤی بەشی پیچ و فاسق و بێرەوشت دبێژیت: ژن ١٧٥€ ددەن بو کرێ گرتنا ئێک ژور بو ٢٤ دەمژمێران دا د دەمێ پێیڤی دا دڤیت ئەو ب کێمی دگەل ٤ زەلامان کارێ پیچ بکەت هەتا بەس بشێت بەس وان پارا بدەت.

ئەڤە ئەڵمانیا بوو دناڤ ڤان بێرەشتی و کارێن پیچ دا روژانەک خەلک لوێرێ موسلمان دبیت و بەرەڤ ئیسلامی مزگەفتین وێ دهیت ...!!

- باژێری ساریبکون ژمارا دانیشتوییێن وێ دگەهیت ١٨٠،٠٠٠ ژ ڤێ ژمارێ ١٠٠ مالێن لەش فروشا تێدانە.

- ل وەلاتێ برێتانیا ٨٠،٠٠٠ کەس مژیلی کارێ بێرەوشتی و سێکسی نە، هەروەسا ئەمریکا و ئوستراليا ب تايبەت سیدنی گەلەکترین کارێن لەش فروشی تێدا دهێنە کرن.

ئەندام پەرلەمان سیلڤیا پانتیان دبێژیت: ( ئەڵمانیا نەڤێت ببیت پایتەختێ لەشفروشێن جیهانێ، دگەل هندێ مە نەڤێت ببین رێگر بو سەرنجا گەشتیاران بو کارێ سێکسی ل ئەڵمانیا )

ژێدەرێن ئابوری:

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

http://www.economist.com/.../21589922-has-liberalisation-olde...

ژ تیلیگرافێ:

http://www.telegraph.co.uk/.../germanys-mega-brothel-left-me.../

ئەز دزانم تو گەلەکێ عاجز بوی دێ سەحکە نیورک پوست ژی :

http://nypost.com/.../germany-experiencing-brothel-boom-but-.../

- پترترین ماڵپەر و کەناڵ و وێب سایت و وێب پەیج ....هتد بو کارێن بێرەوشتی و پیچ ل ئەمریکا د هەر ٣ سێ خولەکان دا فلمەکێ پیچ و گەنی دهێتە تومار کرن سەحکە راستیا وێ د ژێدەری دا ددەمەکێ دا دوو یان سێ یان چار ..هەتا دەهـ بیستەک دچن دەڤ ژنەکێ کارێن خراپ دگەل دکەن و تومار دکەن و دبێژن مافێ ئافرەتێ و ئازادی وەی عەمرێ هەوە نەمینیت ئازادی .....

ژێدەر :

http://www.salon.com/.../sex_abuse_charges_against_ex_school.../

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

http://www.hollywoodreporter.com/…/dr-dre-ice-cube-…break-81

هەی بێرەشت هەوە چ ژ ئیسلامی دڤێت، چونکی بویە رێگر بو حەزێن هەوەیێ پیچ و دەهمەن پیس.

دێ تە دەهمەن پیسی دڤێت دا پێکڤە سەحکەن دەهمەن پیسیێ:

سالانە ملیونان کەس دمرن ژ ئەگەرێ نەخوشیا ئایدزێ ژ ئەنجامێ کارێن بێرەوشتی یە لێکولینەکا سالا ٢٠٠٦ ژمارا وان کەسێن مرین ژ ئەگەرێ نەخوشیا ئایدزێ دگەهیت ٢٥ ملیون کەسان و ٤,٥ ملیون کەس توشی ئایدزێ بونە.

ژێدەر :

http://www.prb.org/Publicatio…/Articles/2007/623HIVAIDS.aspx

پسیار بو نەحەزێن ئیسلامێ:

- ئەرێ وژدانا تە قەبیل دکەت زاروکەک بهێە دونیایێ نزانیت بابێ وی کیە و دایکێ ژ کیڤە هێنایە و هەلگرێ ئایدزێ بیت باشترە یان ئەو دایک و بابێن

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دەهمەن پیس بهێنە کوشن باشترە ...؟! دزانم تو حەز ناکەی بەرسڤێ بدەی ...؟؟

- ئەو زاروکێ هەوە دڤێت پەیدا ببیت بوچی دێ هێتە ڤێ ژیانا هەوە ئەرێ ئەوژی وەکی هەوە دەهمەن پیس بیت و کارێ لەشفروشی بکەت ..؟

- ل فەڕەنسا رێژەکا زاروکبونا بێ پەیوەندیا هەڤژینی ٥٦% ئەڤە بەس ل فرەنسا و رێژەیا زاروکێن ئایسلەندا ٦٧% بێژی نە (نەشەرع و نە یاسای نە) ئێ کیە ئومەتا سکێسی ...؟!!

ژێدەر :

http://edition.cnn.com/…/tra…/wonder-list-bill-weir-/iceland

http://m.nouvelobs.com/rue89/r

ئەرێ کیە ئومەتا بێرەشتی و فاحیشێ و دەهمەن پیسیێ ...؟؟

## بۆچی ئەو زارۆك هاتە كوشتن

پرسیارەک دهێتە کرن کوو ل سورەتا الكهف زارۆکەک دهێتە کوشتن گونەها وی زارۆکی چیە هاتیە کوشتن ؟؟

دەسپێکێ ئەو زارۆك نەبوو و کەسەکی گەنج بوویە چونکی غولام ب زارۆك نائێتن ب چ رەنگەکی بەلکو ب کەسەکی پیگەهشتی بوویە و هەروسا ل قورئانێ خودایێ مەزن دبێژیتە موسای علیە سلام هەرە ڤی جهی کەسەک یێ ل وێرێ شارزایەکا گەلەک زۆر یا هەی و هەرە وی ببینە دا ل وی فێر ببی، نوکە دا بچین دگەل وان ئایەتێ وێ سورەتێ کا ئەڤ رودانا وی چەوا بوویە پشتی هنگی بێژین بۆچی ئەو کوشتیە .

دەستپێکا ڤێ مەسەلێ ل ئایەتا ٦٦ دەست پێدکەت و دبێژیت

قَالَ لَهُ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ( ٦٦ )

موسا (علیە وسلام) پێی گوت: ئاخۆ مۆڵتم دەدەیت شوێنت بکەوم؟ تا لەو زانستەی -لەلایەن پەروەردگارتەوە- فێرکراویت، منیش فێر بکەیت و نیشانمی بدەی، بەڵکو کەڵکی لێ وەرگرم لە کاروبارمدا.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ل ڤێرە دیار دبیت موسا علیە سلام داخاز ژ وی دکەت کوو ئەوژی دگەل وی بچین و زانستی نیشا وی بدەت ئەوێ خودێی فێری وی زانای کری و مفای ژێ ببینیت ژکاروبارێ رۆژانە .

قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ( ٦٧ )

زاناکە وتی: بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگر بیت (بێدەنگ بیت بەرامبەر ڕەفیتارو کردارم، چونکە من شتی سەرسوڕهێنەر دەکەم و تۆ لە نهێنیەکەی تێناگەیت).

ل ڤێرە دیار دبیت ئەو زانا دبێژیتە موسای تو نەشێی دگەل من سەبرێ بگری و نەشێی بێدەنگ بی ل بەرامبەر رەفتارێ ئەز دکەم و تو ژ نهێنیا تێناگەی ، دیارە ئەو دێ هندەک کارا کەتن بۆ مرۆڤی جهێ مەندەهۆشییێیە .

وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا ( ٦٨ )

جا چۆن خۆدەگریت لە بەرامبەر شتێکەوە کە هەواڵت لێی نیە و ئەم سەرو ئەو سەری نازانیت.

ل ڤێرە ئەو زاناژی بخۆ دبێژیتێ تو چەوا دێ سەبرێ گری لسەر تشتەکی کوو چ ژێ نزانی، ل ڤێرە دیار دبیت خودێی پێشی هنگی یێ گۆتیە ڤی زانایەی ڤان کاران بکە و ب فرمانێ وی بووینە و خەبەر یێ دایێ کوو بکەتن و ئەو زاناژی دزانیت موسا نەشێت سەبرێ لسەر بگریت

قَالَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ( ٦٩ )

موسا وتی: دەمبینیت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت خۆڕاگر دەبم و لە هیچ فەرمانێکت دەرناچم.

ل ڤێرەژی موسا دبێژیتێ ان شاء الله دێ سەبرێ گرم ل فرمانا تە دەرناچم، وسا دیار دبیت موساژی یێ پشت راست نیە کوو دێ سەبرێ گریت یان نە .

قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ( ٧٠ )

زاناکە وتی: جا ئەگەر شوێنم کەوتیت ئەوە پرسیارم لەهیچ شتێك لێ مەکە، هەتا خۆم لە نهێنیەکەی ئاگادارت نەکەم.

پشتی هنگی ئەو زانا دبێژیتێ پرسیارا ژمن نەکە حەتا ئەز نهێنیا بۆتە دبێژم لسەر کردارێت من وسا دیار دبیت رەفتارێ وی نە تەبیعینە .

نوکە دا بهێن لسەر رودانا کوشتنا وی غولامی

فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ( ٧٤ )

(دوایی دابەزینە سەر وشکانی) کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشتنە غولامێك، زاناکە گرتی و کوشتی، موسا وتی: سەیرە، ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێت و (شایستەی کوشتن بێت) سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی ناپەسەندو ناڕەوات ئەنجامدا!!

پشتی چوون د رێکێدا غولامەك بینی و وی زانای ئەو غولام کوشت، موسای گۆت تە کارەک عجیب کرد بۆچی کەسەکێ بێ گونەهـ کوشت و ئەو

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

نە هەژی بوو بهێتە کوشتن و موسای سویند خوینـد کوو وی کارەکی نەدرست پێ کری، دیارە ئەڤ کارە هندە جهێ تێرامانێیە لدەڤ پێغمبەر موسای ناهێتە قبول کردن و دبێژیتی تە خەلەتی کرد، بەلێ ژ بیرنەکەن ئەڤ زانایە زانست پێ لدەڤ هەی دزانیت بۆچی ئەڤ کارە پێ کری چونکی خودێی پێ نیشا وی دای .

قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ( ٧٥ )

زاناکە وتی: پێم نەوتیت کە بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا ئارام بگریت و دان بەخۆتدا بگریت.

پشتی موسای گۆتیێ تە خەلەتی یا کری وی زانای گۆتی من گۆتەتە توو نەشێی دگەل من بەردەوام بی و چ پرسیارا نەکەی .

نوکەژی دا بهێین بۆچی ئەڤ غولامە کوشت چ حیکمەت تێدا بوو و ئەو زانا چەوا ڤێ رودانێ بۆ موسای شلۆڤە دکەتن

وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا ( ٨٠ )

غولامەکە (کە کوشتم) دایک و باوکێکی ئیمانداری هەبوو، ترساین لەوەی کە بەسەرکەشی و بێ دینی و خوانەناسی هیلاک و ماندویان بکات .

وسا دیارە ئەو غولام کەسەك بوویە خەلەتیێت مەزن پێ کرین و ترس هەبوویە پێن نزیکی خۆژی بەرەڤ هیلاکەتێ ببەتن .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

زاناکە دبێژیتە موسای ئەو غولامێ من کوشت دایک وبابەکێ دیندار و خودێ نیاس یێ هەین، و ئەم ترسیان کوو ئەو ژبەر کارێ خۆ ئەو بێدین ببیت و تشتەکێ وسا بکەت باب و دایکێ خۆژی ببەت هیلاکەتێ، چونکی هەر ژ نوکە دیار بوو کوو بسەرێکشەیە .

فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ( ٨١ )

(بەو کارەمان) ویستمان کە پەروەردگاریان (لەجیاتی ئەو) پاکترو چاکتریان پێ ببەخشێت و بەمنداڵێکی خاوەن بەزەیی و میهرابانتر بەهرەوەریان بکات .

بڤی کارێ من کری مەڤیا ل شینا وی خودایێ مەزن زارۆکەکێ دی بدەت وان دایک و بابا کوو یێ باش و دلۆڤان بیت.

پرسیارەك: ئەرێ ئەوێ دگەل وی کەسی بۆچی دەمی هاتی کوشتن کەس هەلنەهات یانژی نەرازی بوونا خوە دەرنەبری بەرامبەر ڤی کاری، ئەرێ ئەڤە بەلگە نینە کو ب شێوەکی وسا یێ مری کو خەلکێ دی ژبلی وی کەسی بێن دی نەدیتینە و دەرڤەی جیهانا ماددی بوونە، وەکی چەوا ئەم دبینین ژ نشکەکێ ڤە کەسەك دمریتن، ئانکۆ کوشتنەکا دەرڤەی ماددی بویە .

**ژ کیڤە نڤیسیە پێغەمبەرەک دێ پشتی من هێت ناڤێ وی احمدە؟!**

کافر دبێژنە مە دکیژان دەقێ پەرتوکا پیروز دا هاتیە کو عیسا سلاڤ لێبن گوتیە دێ پێغەمبەرەک پشتی من هێت ناڤێ وی ئەحمەدە؟ چونکە د ئایەتا ٦ێ دا دسورەتا الصف دا خودێ دبێژیت: و اذ قال عیسى ابن مریم یا بني اسرائیل اني رسول الله الیکم مصدقا لما بین یدي من التوراة و مبشرا برسول یاتي من بعدي اسمه احمد،

و ئەگەر ئەم پەرتوکا پیرۆز واتە اینجیلێ بخوێنین دهەردوو بەشا دا باسێ هاتنا چ پێغەمبەرا نەکریە و کافر ڕاست دبێژن !

بەرامبەر ڤێ چەندێ گومان ل دەڤ موسڵمانا چێدبیت کو عیسای سلاڤ لێ بن تشتەکێ هوسا گوتیە یان نە؟ مەبەستا مە مزگینیا احمدی یە ! ،!! بەڵێ خودێ ڕاست دبێژیت کو عیسای (سلاڤ لێ بن) ئەڤ چەندە یا گوتی . باشە پا بووچی ئەڤ مزگینیە د انجیلێ دا نەهاتیە؟؟ بۆ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دڤێت ئەم ل ئەم ل پەرتوکا پیروز ب زڤڕین چونکە عیسا دبێژیت ئەی بنی اسرائیل ئەز یێ هاتیم ڕاستیا تەوڕاتێ بوو هەوە ب سەلمینم و دێ مزگینیەکێ دەمە هەوە کو دێ پشتی من پێغەمبەرەک هێت ناڤێ وی احمدە،

واتە دڤێت ئەم ل دەستپێکێ ل تەوراتێ بزڤڕین . چونکە ئاینێ مەسیحییا بێ تەورات ئاینەکێ هیچە و مەسیح ژی ژبەر وێ چەندێ یێ هاتی دا بسەلمینیت

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

کۆ تەوڕات ڕاستە. و هیچ کەنیسەیەک نەشێت دەستا ژ تەوڕاتێ بەردەت و ب انجیلێ بتنێ حوکمی بکەت.

بەلێ یا سەیر ئەوە د تەوڕاتێ دا ٢٤پەرتوک

(سفرە)ژ تەوڕاتێ بەرزە بووینە.ب بەڵگەیێ دەقێن تەوڕاتێ بخو.وئەگەر ئەم ل پەرتوکا پیروز یا نوکە بزڤڕین دێ بینین کو ٢٤سفرە ژێ کێمن بەرزەنە و دیار نەماینە.

بوو هندێ دا بابەت گەلەک درێژ نەبیت دێ نوکە باسێ ئێک دانە ژ ئەو پەرتوکێن بەرزەبووین کەین و ٢٣ێ دانەیێت دی دێ کەین ٢٣ێ پرسارێت دی .سؤال جرئ بۆ هەوە. کەرەمکەن ئەڤەژی ئێك ژ ٢٤ پەرتوکێن بەرزەیە:

د سفر العدد بەشێ ٢١ێ دەقێ ١٤ێ هەتا ٢٠ێ دا نڤیسییە ژبەر وێ چەندێ (پەڕتووکا جەنگێن یەزدانی ) دبێژیت : واهڤ ل سوفە و شکلێن ئەرنون.

بۆ هندێ کو ئەم ڤی دەقی تێبگەهین. ئەڤ دەقە باسێ وێ چەندێ دکەت دەمێ بەنی ئیسرائیل ژ مصرێ دەرکەتین و هاتین بو وان جها. هین بخوە دشێن بخوینن ژ دەقێ١٤ێ هەتا ٢٠ێ و خودێ ئەو ل وان ناوچا جهـ نشین کرن و ئاڤ ژی دا وان لەوا ئەوان ژی سرود گوت بۆ وێ ئاڤێ و ئەو کەرەم و نیعمەتا خودێ دگەل وان کری. ئەڤ تشتە ژی ل کیڤە نڤیسییە ؟ د( سفر حروب الرب واتە پەرتوکا یان کتێبا جەنگێت یەزدانی ) ئێ باشە نووکە ئەم دهەمی تەورات و کتێبا پیرۆز دا بگەڕین ئەو کتێبە تێدا نینە . باشە پا ئەو کتێبە ل کیفەیە؟

ب مەرجەکێ ئەو کتێبە یان ئەو سفرە دڤێت کتێبەکا زۆر مەزن بیت . چونکە باسێ جەنگێن(شەڕێن) یەزدانی دکەت و چەوا موسای و بەنی اسرائیلیا سەرکەفتن ب دەست ڤە ئینایە؟ یا ژ هەمیێ گرنگ تر ئەڤ کتێبا پیرۆز باسی کتێبا جەنگێن(شەڕێن) یەزدانی دکەت و ناڤێ وان جها دئینیت و چەوا خودێ

ئاڤ دایە وان و چەوا سرۆد گۆتن بوو وێ ئاڤێ .بەلێ کتێب یا بەرزەیە و دیار نینە !! باشە دێ چەوا زانین ئەڤ دەقێن سفر العدد ژ ٢١ ێ ژ دەقێ ١٤ێ هەتا ٢٠ێ راستە ؟؟ ددەمەکێ دا ئەو کتێبە یا بەرزەیە و دیار نینە؟ و چەوا نڤیسەرێن کتێبا پیروز ٧دەق ژ کتێبا جەنگێن یەزدانی

وەرگرتینە و ئەڤ کتێبا نوکە ل بەر دەستێ مە هەی کو ئەو پەرتوکە دیارنینە و بەرزەیە؟

بهەمان شێوە ٢٣ێ پەرتوکێن دی تر ژی ژ کتێبا پیرۆز باس کریە و ژڤێ کتێبا نوکە ل بەر دەستێ مە دەق یێن ژێ هاتین وەرگرتن بەلێ دڤێ کتێبا پیروز دا یا نوکە ل بەر دەستێ مە بەرزەنە و نەدیارن.. ئەم ژی پرسیار دکەین : ئەرێ بۆچی نابیت ئایەتا ٦ ێ ژ سورەتا الصف کو دبێژیت: پێغەمبەرەك دێ پشتی من هێت ناڤێ وی ئەحمەدە ما بەلکو دئێک ژوان ٢٤سفرا دا هاتبیت؟!!کو یێن بەرزە بووین.ئەگەر ٢٤ کتێب بەرزەبووینە کو هین بخۆ دانپێدانێ دکەن یێن بەرزەبوین باشە پا چەوا ناڤێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن یان ئایەتەک ب ساناهی بەرزە نابیت یان هەوە هەوە بەرزە کربیت؟

ئەگەر بێژین عیسای (سلاڤ لێ بن)

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤ چەندە یا گۆتی نەک تەوراتێ ! دڤێت ئەو دەقێ ٦ێ دسورەتا الصف دا د انجیلێ دا هەبیت نەک تەوراتێ؟!!

ل ڤێرێ دبێژین بێ زەحمەت اینجیلا عیسای بوو مە بینن؟چۆنکە ئەڤ انجیلێت ل بەر دەستێ مە یێن نڤێساین ل گورەی مەتای و ل گورەی مەرقص ی و ل گورەی لوقای و ل گورەی یوحەنای.و ل چ انجیلا نەنڤیسایە انجیل ل گۆرەی عیسای یان یەسوع ی یان مەسیح ی.

کەرەمکەن ئینجیلا عیسای نیشا مە بدەن ل کیڤەیە و کێ نڤیسییە؟؟!!

و کەنگی هاتیە نڤیسین؟و هەروەسا مەسیحی یێت کەتینە خەلەتیەکا مەزن تر ئەو ژی ئەڤەیە

ئەو یێن ب دیف پەیمانا کەڤن(عهد القدیم)کەفتین و پەیمانا کەڤن ژی ٢٤ کتێب یێت ژێ بەرزەبووین.ۆاتە بووچی مەسیحی ناچن ل وان ٢٤کتێبێن بەرزە بگەرن؟و ئاینێ خۆە کامل بکەن؟؟

ئەرێ گاور دشێن وان ٢٤کتێبا بوو مە بینن کو دەڤێن ئەڤ کتێبا نوکە ل بەر دەستێ مە ژێ هاتینە وەرگرتن و بەرزەنە و دیارنە ماینە؟!!

پشت ڕاستم نەشێن ئێک لاپەر ژی ژ وان ٢٤ کتێبێن بەرزە بووین بینن. واتە باشە پا چەوا هین داخازێ ژ مە موسڵمانا دکەن کو وێ ئایەتێ بوو هەوە ژ انجیلێ بینین دەر؟

کو دبێژیت:و مبشرا برسول یاتي من بعدي اسمە احمد.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

کەرەمکەن هین ٢٤ کتێبا قەردارن ئەگەر هەر ئێک ژی دەهـ١٠ لاپەر بیت. دگەهیتە ٢٤٠ لاپەرا .ئەگەر هین بشێن ٢٤٠ لاپەرا بەرزە بکەن پا چەوا هین نەشێت ئایەتەکێ یان مزگینیەکێ کو دبیتە نیڤ دێرەک بەرزەبکەن؟!!بەلێ هەوە یا بەرزەکری و ڤەشارتی بەلێ هین دانپێدانێ ناکەن.

**بەحسی(محمد دوماهیک پێغەمبەرێ نە خویندەوار) (س.خ) ل کتێبێن پیروز( تەورات و ئینجیل ) ....**

( الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي( التَّوْرَاةِ )،( وَالْإِنجِيلِ ) الاعراف ١٥٧ ) واتە ، ئەڤێ دلوڤانییێ ئەس دێ بوو وان نفیسم ئەوێن ژ خودێ د ترسن، و ژ بێ ئەمریا خودێ نەکەن، و دویکەفتنا وی پێغەمبەرێ خودێ دکەن ئەوێ نە خویندەوار، کو محمد (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) ، یێ بەحس و سالوخەتێن وی ل تەورات و ئینجیلێ نفیساین،) تەورات کتێبا موسی و ئینجیل کتێبا عیسی ( علیهما صلاة وسلام ) ،

کو د بنە ئاینێ مسیحی و یەهودیان دا بزانین وایە بەحسکریە ، یان قورئان هەلەیە؟!

تە ورات :

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

العهد القديم سفر التثنية : ١٨:١٨:- [ لِهَذَا أُقِيمُ لَهُمْ نَبِيًّا مِنْ بَيْنِ إِخْوَتِهِمْ (مِثْلَكَ) وَأَضَعُ كَلاَمِي فِي فَمِهِ ] واته: ل ناڤ برايێن ته دێ پێغەمبەرەکی دیار کەم هەر چ بێژمێ دێ ڕاگەهینیت !

سفر اشعياء : بەشێ ٢٩ دێرا ١٢ (کتێبەکە دێ دەینە وی کەسی ئەوێ نڤیسینێ نە زانیت و دێ بێژینێ بخوینە ، ئەو ژی دێ بێژیت خواندنێ نزانم)!!

و خودایێ مە زن د بێژیت: ل سورەتا (الشعراء) ئایەتا ١٩٦ و ١٩٧

( وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ ) ١٩٦

واته: بێگومان راستی و درستیا ڤێ قورئانێ ل کتێبێن بەرێ دا بەحسکریە.

( أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ آيَةً أَن يَعْلَمَهُ عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ ) ١٩٧

واته: ارێ ما ئەو زانینا لنک وان زانایێن ئیسرائیلیا هەی یێن باوەرێ ئینای [وەکی عبداللا کورێ سلامی] ما بەسی وان نینە بزانن هندی توی پێغەمبەرێ خودێی.

دبیت مسیحی بێژن ئەڤە بەحسێ پێغەمبەر( عیسی علیه سلام) د کەت ، بەلێ دا ڤێ ژی رونکەین جەند خالەک ل ناڤبەرا (موسی و محمد ) و (موسی و عیسی) علیها صلاة وسلام .

کەواته: د ڤێرێدا دێ تیبینیا هندەک خالا کەین، ژ وانان خودایێ مەزن د ڤێرێ دا بەحسی پێغەمبەرەکێ (برا)دکەت و د بێژیت (مثلك) مەبەست ژ (مثلك) پێغەمبەر موسی یە علیه سلام

واته: ل شێووێ تە یە وەک تە موسا.

ئەگەر ب گەرینە بەرێ پێغەمبەر ابراهیم علیه سلام دوو کور هەبون ناڤێت وان اسحاق و اسماعیل بوون علیهما صلاةوسلام. ب کورتی(وەچێن(بنەمال)

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئیسرائیل ژ بناغێ بنەمالا(اسحاق)ە سەلاما خودێ لێبیت کەواتە عیسی و موسی ژ بنەمالا (ایسحاقن) ئەو پێغەمبەرێ کە برایێ (ایسحاق)ی پێغەمبەر (اسماعیل)ە کەواتە ل ڤێرێ ئەو پێغەمبەرێ پەیدا د بیت کە بەحس د کەین ئەم هەمی د زانین ژ رەچەلا(محمد صلى الله علیەوسلم) د ڤەگەریتە سەر پێغەمبەر اسماعیل.

هەر هوسا سەبارەت ب وێ گووتنا د بێژین واتاوان دێ کەینە د قالبێ [هەر چ بێژم ئەوێ دێ ڕاگەهینیت]. ئەڤەژی ئەوە ئەوا دگەل (محمد صلى الله علیە وسلم ) رویدای چونکە جوبرائیل سەلاما خودێ لێبیت راستەو خو پەیاما ژ لایێ خودێ گەهاندە (محمد صلى الله علیە وسلم ) و باشی پێغەمبەری گەهاندە هەمی شوێنان، .

هەر وەکی د قورئانێ دا ئاماژە پیێ کری .

خودایێ مەزن : ل سورەتا النجم ئایەتا ٢تا٥

مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ٢

واتە : محمد ژ رێکا هیدایەتێ و حەقیقەتێ نە دەرکەتیە، و د سەر دا نە جویە،بەلکی یێ سەر راست و رێ درستە.

وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ٣

واتە ، و ئەو ژ نك خوو نا ئاغفیت

إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ٤

واتە ئەو اخفتنا ئەو د بێژیت کو قورئانە و حدیس و وەحیە ژ نک خودێ تعالا خودێ یە فێ وەحیێ بوو د هنێریت .

تشتێن وەك ئیك د ناڤ بەرا( محمد و موسى عليها صلاه و سلام )

١- هەردوو ب شێوەکێ ئاسای ژ دایک بووینە بەلێ یا پێغەمبەر عیسا معجیزە بوو

٢-هەردووکان ژیانە کا ئاسای بوویە و خودان خێزان و زاروك بوون بەلێ عیسى هوسا نە بوو

٣-هەردووك د ژیانێ دا مرین بەلێ عیسا نە مریە

٤-هەردووك ژ بلی پێغەمبەر بوون فرمان رەوێن گەلێ خوو بوون بەلێ عیسا ب فی شێوەی نە بوو تنێ پێغەمبەر بوو.

٥- هەردوو نەجار بوون کوجبکەن ل سەر ئاینی جهێ ژ دایک بوونێ ب بهێلن ، و موسى کۆج کر بوو مەدین و محمد بو مدینێ بەلێ ئەڤە ل ژینا عیسى روینە داینە.

٦-روبەروو بوون دگەل دژمنان(محمد و موسى سەلاما خودێلێبییت) ب چەند چەنگادا دەرباسبوون بەلێ ئەڤە د گەل عیسى روینە دا .

٧-دەرئەنجامێ وێ روبەروو بوونێ د گەل دژمنان دا هەرئیک موسى و محمد سلاڤێن خودێ ل سەر بن، جەندین سەرکەڤتنێن روحی و ماددی ب دەست کەتن.

٨- هەرئیک موسى و محمد سلاڤێن خودێ ل سەر بن، خودایێ مەزن ل چیان پەیام بوو هنارت( موسى ل چیایێ سینا و محمد ل چیایێ نور) بەلێ عیسى هوسا نەبوو.

٩-ئەو پەياما ل سەر موسى و محمدى چووى هەر د ژيانا خودا ديار و تومار بوو بەلێ پەياما پێغەمبەر عيسى تنێ ب گوتن هاتبوو گەهاندن بوو خلكى و ل سەر دەمێ خوو دانە نفيسى بوو .

١٠-ئەو بيروباوەرێن محمد و موسى پێكدهاتن ژ كومەڵەكا بنەما ژ بنەمايێن روحى و فەرمان و ياسا بەلێ پێغەمبەر عيسى تنێ روحى بوو .

١١-هەر ئيک ژ موسى و محمدى سەلاما خودێ لێ بيت قەبولكرن و خەلكێن دەوروبەر لێ كوومبوون د ژينا خودا، بەلێ پێغەمبەر عيسى قەبيل نەكر د ژيانا خودا پاش پشتى نەتەواوى مرى باش هاتن ئايين وەگرت؟؟

سەبارەت ب خالا يازدێ يوحنا بەشێ ١دێرا ١١ دا هاتيە.

(هات بوو لايێ نەتەوێ بەلێ قەبيل نەبوون پێ)

العهد القديم سفر التثنية : ١٨:١٨:- [ لِهَذَا أُقِيمُ لَهُمْ نَبِيًّا مِنْ بَيْنِ إِخْوَتِهِمْ (مِثْلَكَ) وَأَضَعُ كَلاَمِي فِي فَمِهِ ]

كەواتە ئەڤ يازدە خال ب روونى د سەلمينيت(محمد ل موساى د چييت)

ئەگەر پێغەمبەر(عيسى ل موسى بچيت(وەک ئيک)) عليهما سلام. بەڵگەيەكێ دى ل سەرباسكرنا(محمد) سلاڤێن خودێ ل سەر بن، سفر اشعياء (١٢\٢٩)"١٢ (أَوْ يُدْفَعُ الْكِتَابُ لِمَنْ لاَ يَعْرِفُ الْكِتَابَةَ وَيُقَالُ لَهُ: «اقْرَأْ هَذَا» فَيَقُولُ: « لاَ أَعْرِفُ الْكِتَابَةَ»

بەش٢٩ دێرا ١٢واتا frown emoticon كتێبەكە د دەتە وى كەسى يێ كە نڤيسينێ نزانيت و د بێژتێ بخوينە ، ئەوژى د بێژتێ من خويندەوار نينم )

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەوڤە د مێژوییێ دا هەیە موسلمان یان غەیری موسلمان ئەگەر شارەزای د ژیانا پێغەمبەری دا هەبیت (س.خ) ل وی دەمی جوبرائیل سەلاما خودێ لێبیت هات بوو لایێ پێغەمبەری (محمد) (س.خ) و گووتێ بخوینە محمدی ژی گووت ئەس خوێندەوار نینم )

گورانی گوڕانیە کان (بەشێ ٥ دێرا ١٦ )

( حکو ممتکم دخلیۆ محمدیم )

ئەڤە ناڤێ وی (محمد) دوماهیک پێغەمبەرێ خودێیە تەمامکەرێ تەورات و ئینجیلە.

وە ئەو پاشگرێ (یم) ل دوماهیێب شێوێ (محمدیم) هاتیە بوو وێ یەکێ واتا رێزگرتنێ د گەهینیت (وەک ئەڤە ل ناڤێ خودا داهاتیە ب زمانێ عیبری ل وشا(الوە) دبیتە (الوهیم)وە(محمد) د بیتە (محمدیم)

کەواتە (محمد) کیە ل کتێبا پیروز؟؟!

ئەڤە ناڤێ پێغەمبەرێ ئیسلامە (س.خ) ل کتێبا پیروز پەیمانا دروست ئینجیل( بەشارەت : مژدە)

ل ئایەتەکا دی دا سورەتا الصف ئایەتا ٦ خودێ د بێژیت : (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ(أَحْمَدُ )فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ) ل ڤێرێ عیسی (س.خ) نەهات بەنی ئیسرائیل ،

بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ

واتە : و توو بوو مللەتێ خوو بێژە دەمێ عیسایێ کورێ مەریەمێ گوتیە مللەتێ خوو: هندی ئەزم ئەس پێغەمبەرێ خودێ مە بوو هەوە، و ئەس راستیا وێ تەوراتێ بوو هەوە ئاشکەراکەم ،یا بەری من هاتی ئەس شاهدەیێ ل سەر راستگوویا وێ پێغەمبەری د دەم ئەوێ دێ پشتی من هێت ناڤێ وی (ئەحمەدە) ، و ئەو محمدە ، ڤێجا دەمی محمد ب ئایەتێن ئاشکەرا بوو وان هاتی، وان گوت ئەڤا توو بو مە پێ هاتی سێربەندیەکا ئاشکەرایە..

دابزانین ئینجیلێ تشتێ هوسا هەیە ؟؟

بەلێ هەیە

متا بەشێ ٥ دێرا ١٧

ژ بیر نەکەن ئەس یێ هاتیم تەورات یان پێغەمبەران پوچەل بکەم ، نەهاتیمە بوو پوچەلکرد بەلکی بوو تەمام کرنێ !

هەر وەکی د بەشێ ئیکێ دا ئەو راستکریە کە بەلێ ل تەوراتێ ئاماژە پێ کریە کو پەیامبەرەکێ نەخویندەوار و ژ بنەمالا ابراهیمە علیە سلام

دا بزانین ئەرێ ئەڤ ئایەتا قورئانێ راستە ؟؟ ئەرێ عیسی ب بەلگە کوتیە دیڤ من دا دێ پێغەمبەرەکێ دی هێت و دێ دینی تمام کەت هەمیتشتان دێ بێژیت ئەوێت ئەس نەشیام بێژم ئەو دێ بێژیت و تمام کەت ؟؟؟

بەلێ ل جەند شوێنا ئاشکەرا کریە

پەیاماتازە یا ئینجیل:-

یا ئیکێ

ئینجیلا یوحنا : بەشێ ١٤

١٥

ئەگەر وە ئەس خوش دڤێم ئەوا ئەس پێهاتیم هەبژاردن (راسپاردن) دێ ب جهئینن

١٦

ئەز داخاز ژ بابێ خو دکەم کو (معزی) یەکێ بۆ وە فڕێ کەت کو هەتا هەتایێ گەل وە بمینیت

١٧

(روحی راستی) کە جیهان نە شێت وەربگریت ، جونکە نابینن و نانیاسن، بەلێ هین د نیاسن جونکە دێ دگەل هەوەبیت .

ئینجیلا یوحنا : بەشێ ١٥

٢٥

بەلێ ئەفە بوو هەتا ئەو گووتنە بێتە ڕێ ل تەوراتێ نڤیسیە :[ب بێی هو رقیان لێم بووە.

٢٦

ل وی دەمێ هاریکارەک د هێت ، ئەوی ژ لایێ بابکی ڤە بو وە دێ نێرم، (ڕوحی راستی) ژ بابی د هێت، ئەو شایەتیێ بوو د دەت.

٢٧

هوین ژی دی شهادەتێ دەن، جونکە ل دەستپێکێ د گەڵ منن.!!

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئینجیــلا یوحنا : ١٦

٧

بەلێ راستیان دێ بێژم ، باشەرە ئەگەر بجم ، جونکە ئەگەر نەجم ، (هاریکار)بوو هەوەناهێت، بەلێ ئەگەر بجم دێ بوو هەوە هنێرم.

٨

دەمێ ئەو دهێتە جیهانێ ، لێ پرسین دکەت ل سەر گونەه و ل سەر راست و درستی و ل سەر حکومدایە!

چوارێ

ئینجیلا یوحنا : بشێ ١٦

١٢

هیشتا تشتێن زور هەنە بوو هەوە بێژم ، بەلێ نوکە نەشێن بەرگێریێ بکەن .

١٣

بەلێ ل دەمێ ئەو هات (روحی ڕاستی) ئەو راستیێ تمام رێنیشان دەردکەت ، جونکە ژ دەڤ خوو نابێژیت، بەلکی ئەوا گولێ د بیت د بێژیت و ڕادگەهینیت چ ریدەت

١٤- ئەو سوپاسیا من دکەت .جونکە ژ من وەردگریت و ڕا دگەهینیت.

١٥-هەر چ بابێ من هەیە یا منە . ژبەرهندێ من گوت روح ژمن وەرگرتییە و ب وە رادگەهینیت .ل ڤێ دەڤێ بەحسێ(روحا راستی)دکەت .کو بزانین روحا راستی چیە؟ لدیف ئینجیلێ:-

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەگەر بزڤرینەڤە بۆ پەیاما (یوحنا الاولی الإصحاح الرابع ٢:١) كو بەحسێ روح دكەت . مانا وێ یە بەحسێ پەیڤا(الاروح)ل گەل پەیڤا(الانبیاء)دكەت . دبێژیت ئەو روح دسەلمینیت كو عیسا پێغەمبەرێ خودێ یە و ئەو روحە راستەقینەیە و عیسا پێغەمبەڕێ راستەقینەیە.ل پەیاما (یوحنا الاولی ٤:١)هاتیە كو دبێژیت خوشتڤی ێت من باوەڕ ب هەمی روحەكێ نەكەن. ئانكو ئەو روح تاقیبكەن . ئایە ژ لایێ خودێ هاتیە یان ژی نە .جونكی گەلەك پێغەمبەرێت درەوین دەرچووینە و دبێژن ئەم پێغەمبەرین .ئەوێ دفێرێدا گرنگە ئەوە كو گەلەك ب روونی ناڤێ (محمد صلی الله علیە و سلم )هاتیە ل سەر سفرا ستران و سترانبێژان ل بەشێ ٥ دێڕێ ١٦دەمێ شرینە (سەراپای خۆشەویستی) ئەڤە ئەڤینداریێ منە ،ئەڤە یارا منە.

ئەوێ فێرێدا گرنگە ئەوە كو ناڤ ب خەلەتی هاتیە وەرگێران كو نابیت ناڤ بهێتە وەرگێران .بۆ نموونە هەكە ناڤێ تە (brawn)بیت ئەگەر تو بكەیە كوردی دێ بیتە(بەڕێز قەهوای)؟؟ چاوا تشتێ هوسا دبیت .ناڤێ (محمد) گوهارتینە ب خوشتڤی یان ژی گەلەك خوشتڤی.

تێبینی:-(معزی و محمدیم و احمد)هەر هەمی رامانا ناڤێ (محمد) دەت.بەلێ بشێوەكێ پلا بلندتر .یان ئەو كەسێ گەلەك مەدحێ وی دكەن یان گەلەك خوشتڤییە....

مانا وێ یە ئەو گەلەك روونە كو ل (تەورات و ئینجیل )مزگێنی هاتیە یان ژی هاتینە ئەگەهداركرن كو دیڤ دوماهیك پەیام و پەیامبەر بكەڤن.....

## موسڵمانان توندڕەو و تیرۆرستن:-

پرسیار:-ئەرێ بۆ چ زوربەیا موسڵمانان توندڕەو وتیرۆرستن؟

بەرسڤ:- فێ برسیارێ گەلەک جارا دهێتەبەر موسڵمانان فێجا ب شێوەکێ راستەخۆ یان ژی ناراستەخۆ بیت،یان دەمێ گەنگەشەکرن دەربارا ئاینێ ئیسلام یان ژی ئەو روودانیت ل جیهانێ روودەن.ب شێوەکێ گشتی سەحکرنا موسلمانان بەردوامی هەیە ل ڕاگەهاندنا ئەڤە ژی هۆکارا کەمی زانیارییە دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان،ل ڕاستی دا ئەڤ پروپاگەندەیت شاش دەربارەی ئاینێ ئیسلام زورجار دبیتە ئەگەرێ جێوازیا ل رفتارِ و کرداریت توند و تیژ بەرامبەری موسلمانان.

ئەو حالەتێ کو ئەڤ د سەلمینیت ئەوە کو دبێژنێ "کەمپینا دژە - موسلمانان" ل ڕاگەهاندنەکا ئەمریکی ڕاستەخۆ پشتی روودانا تەقینا (ئۆکلاهۆما).رۆژنامیت وان گەلەک ب لەزبوو .کو ڕاستەخۆ بانگەشەیا چیرۆکێ پڕو پوچ بکەن کو ڕوژهەڵاتا ناڤەراست ل پشت وێ هێرشێ بوون ل (ئۆکلاهوما).

بەلێ پشتی هنگێ دەرکەڤت لایانێ بەرپرس ل تەقینا (ئۆکلاهۆما) ئەڤسەرەکێ هێزا سەربازی ئەمریکی بوو .

دا هەردوو چەمکێت "توندڕەو"،"تیرۆرست" شلوڤەبکەین:-

١-پێناسا چەمکێ " توندڕەو " :-

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دبێژنە ئەوان کەسا توندڕەو ئەوێ ل دیڤ بنەما وبنەڕەت سەرەکیا  بیڕو بۆچون و ئایدۆلوژیا خو دچیت ئەوا باوەڕی پێ هەی وپشتگیڕی لێ دکەت.بۆ کەسەکێ کو بڤێت ببتە نوژدارەکێ باش پێتڤیە بنەما وبنەڕەت وسەرەکێ نوژدارێ بزانیت وبهێتە بەرجەستەکرن .

بۆ کەسەکێ کو بڤێت ببتە بیرکاری زانەکێ باش و لێهاتی پێتڤیە بنەمایت بیرکاری بزانیت و لدڤ وان بچیت و شیانا جێ ب جێکرنا وان هەبیت .و پێتڤیە ئەو کەس توندڕەو بیت ل بوارێ بیرکاریێ دا .

بۆ کەسکەکێ کو بڤێت زانا و لێهاتی بیت پێتڤیە شەهرەزا بیت و شوێن و بەرجەستێ و سەڕەکیێت زانستی هەبیت پێتڤیە کەسەکێ توندڕەو بیت دبوارێ زانستی دا.

٢-بشێوەکێ گشتی هەمی توندڕەو نە وەک ئێکن:-

چێ نابیت هەمی توندڕەو وەک ئێک بهێتە سەحکرن ،چێ نابیت هەمی توندڕەو ل بن نافونیشانا خڕاب یان ژی باش بهێتە کۆمکرن ،دابەشکڕن یان ژی بەچینکرنا توندڕەو پشت دبەستیت ب وێ بوارێ یان ب وێ کرداڕێ کو توندڕەو تێدایە

کەسێن توندڕەو دبنە هۆکارا کێشە و نەخۆشی بۆ کۆمەلگەھ ،ژ بەر هندێ ئەو کەسانێت خوازراو نین ،ئەڤە ل دەمەکێ دکتۆرەکێ توندڕەو مفا ب کومەلگەهێ دگەهینیت ودبیتە خودان ڕێز و قەدڕ.

٣- شانازی دکەم کو ئەز موسلمانەکێ توندڕەوم:-

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەز موسلمانەکێ توندڕەوم کو بشت بخودێ و بنەماێت سەڕەکی و بنەڕەتیێت ئیسلام دبەستم .و لدیڤ دچم و شییانێت خو بکاردهینم بۆ کارپێکرنا وێ.

موسلمانێ ڕاستەقینە شەڕم ناکەت کو بوویە توندڕەو .شانازی دکەم کو موسلمانەکێ توندڕەوم چنکی دزانم بنەماێت سەرەکی وبنەڕەتێت ئیسلام سودبەخشن بۆ مرۆڤایەتی وجیهان بگشتی .هیچ بنەمایەکێ ئیسلام نینە کو زیان بگەهینیت یان ژی بەرۆڤاژیا بەرژەوەندیێت مروڤی بن بگشتی .گەلەک ژ خەلک بۆچونێت خەلەت هەنە کو هندەک کومەل وبنەما و ڕێنماییێت ئیسلام نا دادپەروەرن نە یێ شیاون .ئەڤە ژی دەرئەنجامێ وان زانیاریا کێم و خەلەت کو دەربارا ئیسلامێ هەنە . ئەگەر کەسەک ب ئەقلەکێ ڤەکری و فراوان ڕابیت بشلوڤەکرنا بنەماێت ئیسلام ئەو کەس دگەهیتە ئەو ڕاستی کو ئاینێ ئیسلام سودبەخشە ل سەر هەردوو ئاستێ تاکە کەسی و گومەلگەه .

٤-پێناسا چەمکێ "توندڕەو" لدیڤ فەرهنگێ:-

لدیڤ فەرهنگێ ((وێبستێر))،توندڕەو لڤینەک بوو لناڤ ئەمریکا پرۆتستانتی کو ل دەسپێکا سەدێ بیستێ سەر هەلدا .ئەو کارڤەدان بوو دژ بە نی بوونەڤە . هەرهوسا جەختکرن بوو ل کەم و کوڕتی ئینجیل نە ژلایێ باوەڕ یان کردار بالکی وەک تومارا مێژوویی پێداگیری کرن کو ئینجیل ئاخفتنێت خودێ نە. فێجا "توندڕەو"چەمکەکە ل دەسپێک د هاتە بکارهینان بۆ ئەو گروپێت مەسیحی کو ل وێ باوەڕێ دا بوون کو ئینجیل ئاخفتنێت خودێ یە بێ خەلەتی و دەست تێ وەردان.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

لدیڤ فەرهەنگێ((ئوکسفۆرد)) "توندڕەو"

بریتیە ژ دەستگرتنەکا توند ب بیرو باوەرێت دێرینێ هەر ئاینەکێ ب تایبەتی ئیسلام.

ئەڤرۆ هەر ل گەل بکارئینانا پەیڤا "توندڕەو" ژ لایێ هەر کەسەکێ راستەوخۆ بیر ل موسلمان دکەن کو تیرۆرستە.

٥-پێتڤیە هەمی موسلمان تڕسناک بێت :-

پێتڤیە هەمی موسلمانان ترسناک بیت.تڕسناک ئەو کەسەکە کو دبیتە هوکارا تڕس و بزداندن .ل دەمێ دزەک پۆلیسەک دبینیت دترسیت .پولیس کەسەکێ ترسناکە بۆ ئەو دز .ب هەمان شێواز دبیت موسلمان ترسناک بیت بۆ ئەوێت دژی بنەماێت کومەلگەهـ وەک دز یان بکوژ و دەستدرێژێت کومەلگەهـ. هەر دەمێ ڤان جورە کەسا موسلمان ببینن پێتڤیە بترسن.ڕاستە چەمکێ "ترسێنەر"ب گشتی دهێتەبکار ئینان بۆ وان کەسا کو دبیتە هوکارا تڕس و بزداندن ل ناڤ خەلک بگشتی،بەلێ موسلمانا راستەڤینە پێتڤیە ترسێنەر بیت بۆ گڕوپەکێ دەستنیشان کری ژ خەلکێ بۆنمونە ئەوێ دژی بنەماێت کومەلگەهن نەک بۆ کەسانێت بێ تاوان .ب راستی پێتڤیە موسلمان ببیتە هوکارا ئارامی و ئاسایش بۆ خەلکێ بێ تاوان.

٦- ناڤ و نیشانێ جیاواز د دەنە هەمان کەس ژ بۆ هەمان کردار بۆ نموونە"تیرۆرست"

"نشتیمان پەڕەوەر.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بەری هندستان ئازاد بیت ل بن دەستێ بریتانیا،هندەک ژ شەرکەڕ و ئازادخوازان کو پشتگیڕیا توند وتیژی نەدکڕن ب تیروڕست هاتە ناڤ کرن ژ لایێ حکومەتا بریتانیا. و هەمان ئەو کەس دهاتنە ڕێزگرتن ژ لایێ حکومەتێ هندستانێ و دهاتنە ناڤ کرن ب نشتیمان پەروەڕ . ڕامانا وێ یە دوو ناڤێ جیاواز هاتەبکارهینان بۆ هەمان گڕوبێ خەلک و کردار

ئیک ژ وان ب تیڕورست ناڤبڕن ل هەمان دەم یێت دی ب نشتیمانپەروەر ناڤبڕن.ئەو گڕوپێ باوەڕ هەبیت کو بریتانیا ماڤێ حکومەتێ هندستانێ هەی .ئەو گروپ دبێژنێ تیڕورست ل دەمەکێ دی دا گڕوپەکێ دی باوەر هەبوو کو بریتانیا ب هیچ شێوەکێ ماف ژ حکومەتێ هندستانێ نینە ئەو گڕوپ ب نشتیمانپەڕوەر و شەرڤان و ئازادخواز ناڤبرن. هەڕ ژ بەرهندێ کەلەگ گرنگە بەر تو بڕیار ل سەر کەسەکێ بدەی پێتڤیە تو گوهێ خو بدەیێ .وپێتڤیە گوه ژ هەردوو لایان بهێتەگرتن و وێ بارودۆخێ ژی شلوڤە بهێتەکرن .هۆکار و مەبەستێ کەسی دیاربکرێت و پشتگوه نەهێتە ئێخستن ،بشتی ڤێ چەندێ هەمی تو دشێی بڕیار ل سەر کەسەکێ بدەی.

٧-ئیسلام ڕامانا وێ ئاشتی دگەهینیت:-

چەمکێ ئیسلام ژ ڕەگێ "سەلام"هاتیە کو رامانا ئاشتی دگەهینیت.ئیسلام ئاینێ ئاشتییە و شوێنکەڤتی ێت خو پەروەردە دکەت کو پشتگیری و هەول بۆ بدەست ئینانا ئاشتی بدەن ل سەران سەرێ جیهانێ.ژبەڕ ڤێ جەندێ پێتڤیە هەمی موسلمان توندڕەو بن بۆ وێ جەندێ کو ب توندی چەمک و بنەما سەرەکی و بنەرەتی ێت ئیسلامێ فێربن و پشتگیری ژێ بکەن .هەرهوسا

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ژێ پێتڤیە تیڕورست بین بەرانبەر ئەو کەسێ کو دژایەتی ل بنەما جڤاکێ دکەت کو بەڕڤ ئاشتی و دادپەروەری دجیت ل کومەلگاهـ.

**ئایەتێت قتالێ د قورانێ دا ١**

**ئیسلام دبێژیت هین لکیرێ بگەهنە کافرا وانا بکوژن ؟**

دا لسەرفی بابەتی باخڤین وگومانا دژە ئیسلامیا ژناف

ببەین

بەلگەژی ئایەتا ٤ ژ سورەتا محمد

فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ( ٤ )

چەندجارا من یێ ژ بێدینا گوهلێبوی کو دەسپێکا ڤێ ئایەتێ هوسا تەفسیر دکەن کو (هین لکیرێ) گەهشتنە کافرا لستویێ وانا بدەن

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بەلام درەوە چونکی وشا هەر لکیرێ بو بازار و بەردەرگە و هەر جهەکی دهێت ئەڤە ژی درەوە و دیرە ژ راستیێ

دا بهێنە سەر راڤەکرنا ڤێ ئایەتێ:-

دبێژیت :- ((فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ))

(هەگەر گەهشتنە کافرا لستویێ وانا بدەن )

باشە کەنگی دکیش وەختی دا ؟؟

پاشی دبێژیت:-

( حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ )

(هەتا وی وەختێ(لوی وەختێ)کوشتن زێدەبوو پاشان وانا دەستگیر کەن)

لڤێرێ دا دیار دبیت کو باسی مەوقفەکێ جەنگێ دکەت وراماں ژپەیڤا لملێت وانا بدەن ئەوە کو شەری دگەل وانا بکەن و تەسلیم نەبن.

حەتمەن مەبەستا وێ ژ دەستگیر کرنێ ئەوە کو ئێخسیارا وەرگرن داکو دوبارە دەست شەری نەکەن.

لڤێرە درەوا وانا دیاردبیت دەمێ دبێژن قورانێ یاگوتی هەما وە لکیرێ کافر دیتن وانا بکوژن

چونکی یارون و ئاشکەرایە بەحسا جەنگێ و دیل گرتنێ دکەت

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئێ پاشی چ بکەین ؟؟

فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ))

(یان وانا سەربسەر انکو دگەل ئێخسیرێت خو بەدل کەن یان ب منەت وانا ئازاد کەن هەتا جەنگ بدوماهی دهێت )

برایان لڤێرێ ۲ درەوێت وانا ئاشکەرا دبن

۱:- هەگەر گوتبیت هەما وە کافر لکیرێ دیتن بکوژن .ئەرێ بوچی فەرمانا وا هاتە کرن کو ئێخسیرا بەردەن بوچی نەدگوت واناژی بکوژن ؟؟

۲:-پاشی لدوماهیا ئایەتێ درەوا وانا ئاشکەرا دبیت چونکی دبێژیت هەتا جەنگ ب دوماهی دهێت انکو بەحسا مەقفەکێ دناف شەری و جەنگێ دا دکەت نەک هەما وە لکیرێ دیت بکوژن

هە ر لسە ر ڤی بابەتی ئەو دچن (نیڤ ئایەتەکا) دی دئینین کو اسلامێ ب دینێ کوشتار و خین رشتنێ بقەلەم دەن

ئایەتا ۱۲ یا سورەت ئەنفال

[ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ ]

(ئەزژی دێ ترس و رعبێ ئێخمە دلێ بێباوەران دا دێ فێجا هین ژی لستویێ وانا بدن)

عەزیزان وەکی هەمی جارا ئایەتا دبرن و بەحسا وێ ب کاملی وتەفاصیلی ناکەن وهەگەر ئەم فێ ئایەتێ بکاملی بخینن دێ یا هوسا بیت

[ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ( ١٢ ) ]

(ئەی محمد یادا وێبکە دەمێ خودای وەحی کر بو فریشتان کو ب راستی ئەز هەڤال و هوگرێ وەمە هین ژی دلێت ئیماندارا پابەند و سابت بکەن ، ئەف جا (ئەی فریشتان) ئەز ژی دێ ترس و رعبێ کەمە دلێ بێ باوەران دا دێ فێجا (ئەی فریشتان) هین ژی لستویێ بێ باوەران بدەن )

هەڤالان لدەسپێکا ڤێ ئایەتێ هەمی تشت یێ صافی کری چنکی ئەڤ ئایەتە فەرمانە (امر) ە بو فریشتان نەك بو مرۆڤان ،

## وان بکوژن یان جزیێ لێ وەرگرن ؟ جزیە چیە ؟

سورەتا تەوبەیە ئایەتا ٢٩

//قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ( ٢٩ )//

عەزیزان وەکی هەر جار دژە ئیسلام سەرەتایا ڤێ ئایەتێ کو نڤیسیە (قاتل) دەمێ ئەو تەرجومە دکەن دکەنە بکوژە (اقتل)

لەوما هیڤیدارم ئەم جیاوازیا ڤان هەردو پەیڤا بزانین کو هندی ئەرد و ئەسمانا ژێك فەرقن

عەزیزان (قاتل) لسەر وەزنێ (فاعل) ە بو کارەکی هاتیە کو گوتیە بجەنگە نەك بکوژە

ئەڤەجارێ مە درەوا وانا زانی

دبێژیت :-

( قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ )

(شەرێ وانابکەن ئەوێت باوەری ب خودێ وب روژا دوماهیێ نەی )

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دسەردەمێ پێغەمبەری دا کی بوون باوەری بخودای و روژا دوماهیێ نەی ؟؟ وئەڤ ئایەتە د چ زەمەن دا نازل بو؟؟

بێگومان مەزنێت قورەیشیان بوون کو رێگری ل کاروانێت موسلمانا دکرن و مالێ وانا تالان دکر ئەفجا خودای ئەڤ ئایەتە دوی زەمەنی دا ئیناتە خار و فەرمانا موسلمانا کر کوبێدەنگ نەبن سەر نەحەقیا لوە دهێتە کرن و (شەرێ) وانا بکەن ، ودگونجیت لسەردەمێ مەژی کو ئەم نەحەقیێ لسەر اسلامێ و خو قەبیل نەکەین

پاشی دبێژیت :-

[ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ]

(شەرێ وانا بکەن ئەوێت ئەوان تشتێت خودێ و پێغەمبەری حەرام کرین حەلال دکەن )

دڤێت لڤێرێ بزانین خودا و پێغەمبەر چ تشت حەرام کریە

کو ئەو کەسێت ئەو تشتێ خودێ حەرام نەکرین ب حەلال دزانن کینە !! دا بزانین خودای چ حەرام کریە و ئەو بحەلالی دزانن

د سورەتا انعام ئایەتا ١٥١ خودا دفەرمووت :-

[ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ]

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

کەواتە ئەم دبینین خودای کوژتنا کەسەکێ بنەحەقییا حەرام کری و ئەو کەسە کوشتنا بنەحەقی بحەلال دزانن

پاشی خودا دسورەتا النساء ئایەتا ٢٩ دبێژتە مە :-

[ وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ( ٢٩ ) ]

لڤێرێ انفسکم ب دوو رامانا دهێت

ئێك خونەکوژە بتاك

و خونەکوژن ب کوم

لڤێرێ خودای ئەڤە ژیك یا حەرام کری، انکو کوژتنا حەرام کری کو لدەڤ هندەکا بحەلالی دزانن ، چونکی ئەڤ ئایەتا لدەسپێکێ دبێژیت شەرێ وان کەسا بکەن یێ کو وی تشتی حەرام ناکەن یێ خودێ حەرام کری و یا دیارە کو خودای کوشتناحەرام کری کو ئەو بحەلالی دزانن

پاشان ئەم دزانین کو خودای ( دزی وزنا و کوشتن و هەمی کاریت خراب یێت حەرام کرین ) باشە کەسێت دزی و کوشتن و زنا .....هتد لدەڤ وانا حەلال بیت ئەو کەسە کینە ؟

ئانکو خودا دبێژیت شەرێ وانا بکەن یێ حەرامیا(کوشتن ،دزی،زنا ،تاڵان کرن...هتد) بحەلالی دزانن

لڤێرێ دا خودایێ مەزن اسلامێ ژ داعش و تەنزیماتێت تیرورستی بریء دکەت و ئەمرێ مە دکەت کوشەرێ وانا بکەین چونکی ئەو کوژتنا خەلکێ بێگونەه حەلال دکەن کو خودای یا حەرام کری

دێ هێنه سەر دوماهیا ئایەتێ كودبێژیت :-

[حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ]

عەزیزان دژە اسلامی بدرەوترین و بوهتان ترین شێوە ڤێ ئایەتێ تەرجومە دكەن ، كو ئەو دبێژن دەستێ خو درێژ كەنە وانا وبلا جزیێ بدەن و وان بكەنە ملكێ خو انكو عەبدێ خو ئەڤەژی درەوترین ئاخفتنە

لدەسپێكی دا بزانین جزیە چیە ؟؟

جزیە ژ جزاء هاتیە انكو پاداشت

باشە جزیە دان بو چ پاداشت ؟؟

عەزیزان پاداشتێ هندێ كو ئەو نەتەوە و خەلكە ل دەولەتا ئیسلامێ دا دژین و دینێ خو پەیرەو دكەن، بەلێ بەژداریێ دچ جەنگادا ناكەن و بئارامی لمالێت خونە ، بەلێ هەكە ل وەلاتەكێ دی با دڤیا نەڤیا با دا بەشداری شەربین

باشە كی جزیێ دەت ؟ د ڤێ ئایەتێ دا دبێژیت (عن يد) انكو خودان دەسهەلات و پارە و هە روەكی ئەم بكوردی دبێژین یێ دەست درێژ و پێچێبوی

ئەوێت دەستهەلات و پارە هەین ئەو دێ جزیێ دەن ،ئەوێ نەبیت نادەت

پاشی دبێژیت وهم صاغرون واتە ب مەمنونی و بكەیفخوشی نەب سەرشوری بلا بدەن

باشه ئەڤ جزیەیه بو کیڤه دچیت ؟

دچیته بیت المال کو داهاتوی دا هەر بو خودانێ وی پارەی دچیت

**وه لکیرێ بێباوەر دیتن وانا بکوژن ؟!**

ئایەتا ٥ ژسورەتا تەوبه :-

[ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ( ٥ )]

(افجا هەگەر هەیڤێت حەرام خلاس بوون پەیمان شکێنا بکوژن لهەر جهەکێ بدەست وەکەتن یان ژی وانا ب دیل بگرن سنورا بو چالاکیێن وانا دانن ،هەروەسا کەمینابوانا لهەمی جها بدانن ، افجا هەگەر تەوبه کر و ئەو کاره

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هێلان و نڤێژ کرن و زەکات دان وانا بهێلن و رێکێ بو چوول کەن چونکی براستی خودێ لێخوشبوو و دلوڤانە )

عەزیزان لدەسپێکێ دڤێت ئەم بزانین ئەڤە سورەتا تەوبەیە و سەبەبێ هاتنا وێ بزانین کو بێباوەران پەیمان دابوموسلمانا

و پاشی پەیمانا شکاند وئەم هەمی دزانین حوکمێ پەیمان شکاندنێ دنافبەرا دوو دەولەتان دا چیە

بەلێ ان شاءالله دێ هێینە سەر ئایەتێ کو باس ل هەیڤێت حەرام دکەت ، و دبێژیت پشتی هەیفێت حەرام خلاس دبن بێباوەرا بکوژن .....هتد

هەتا ڤێرێ و ڤێ ئاخڤتنێ نەمشکیلەیە

بەلێ لدوماهیا ئایەتێ دبێژیت هەگەر هێلا و دەستبەردار بوون !!

ئەڤە لڤێرێ مەوزوع روون دبیت دگەل من بە

باشە بوچی پشتی هەیفێت حەرام شەرێ بێباوەرا بکەن ؟

ئەرێ ما وانا چ کربوو؟

دا سەحکەینێ

هەر لسورەتا تەوبە بەرسفا مە دهێتە دان ل ئایەتا ١٣

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

[ أَلَا تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ....... ]

عەزیزان بەری روون کەم سەحکەنە دووماهیا ئایەتێ بدءوکم أول مرة

(باشە ماهین ناجەنگن دژی هندە کەسا کو بەلێن و پەیمانا خو شکاندی و هەولدای پێغەمبەری ژ مەککە هێ دەرکەن((وهەروانا لدەسپێکێ دەست ب دژایەتیێ کر )))

عەزیزێت من هەروەکی وە دیتی ئایەتا وازحە و دبێژیت وانا اول جار دەست ب دژایەتیێ کر لدژی موسلمانا

وبومەدیاردبیت کاوانا چ کربوو کو موسلمان حەقێ خو ژوانا بستینن

ئەو هەتا ڤێرێ بو کەسێ ژیر بەسە بەلێ چنینە دێ بەردەوام بین

هەر ل درێژیا هەمان بەحس و هوکار ل ئایەتا ٣٦ سورەتا تەوبە دبێژیت:-

[ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ]

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بتنێ لدژی موشرکێت (شەرخاز ) بجەنگن بگشتی ،هەروەکی ئەو دژی وە دجەنگن بگشتی

عەزیزان ل ئایەتا سەری مەزانی کو وانا دەست ب جەنگێ کر دژی موسلمانا هەروەسا خودای فەرمان کرکو پشتی هەیڤێت حەرام دژی وانا بجەنگن

انکو هەتا دژی موسڵمانا نەجەنگی نابیت دژی تە بجەنگن ئەڤە ژی یاسایا خودای یە

بەحس لڤێرێ تمام تمام بو بەلێ دێ خزمەتا ئایەتەکا دی کەین کو دژە ئیسلامێ یا کریە گومان

ئایەتا ٢١٧ سورەتا بەقەرە :-

[ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ ........ ]

(دێ پسیارا تەکەن دەربارەی جەنگێ ل هەیڤێت حەرام دا ، بێژە جەنگ لوان هەیڤا کارەسات و خەلەتیەکا مەزنە و رێگریە ل رێبازا خودای و بێ باوەر

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بی بێ ، جەنگ ل مزگەفتا حەرام ودەربەدەر کرنا خەلکێ وێ زور مەزنترە لدەف خودای هەروەها فتنە ژ کوژتنێ مەزنترە بەردەوام دژی وە دجەنگن هەتا کو وە ژئاینێ وە دیربکەن )

عەزیزان سەحکەنە دوماهیێ دبێژیت بەردەوام دژی وە دراوەستن داکو وەژ ئاینێ وە دیربکەن

ب کورتی :-

پەیمان لنافبەرا موسلمانا و بێ باوەرا هەبوو

ئێك :- بێ باورا پەیمان شکاند

دوو :- دەست ب دژمنکاری یا موسلمانا کر

سێ:- لگەل هەمی موسلمانا شەر دکرن بێ جیاوازی

ێ ئەم دبینین هەکە کەسەك فێ دگەلتە بکەت مافێ تەیە دژی وی براوەستی و حەقێ خو لێ وەرگری

لەوما خودای فەرماندا پشتی هەیڤێت حەرام شەرێ وانا بکەن

و هەروەها خودا امر دکەت کو بتنێ دژی وانا راوەستنیێت کو دهێنە شەرێ وە

**پرسیارەک دهێتە کرن و دبێژن بۆچی خودێی ستالی و سەدام و هێتلەر و هندەک دکتاتۆری دی نەکوشتن هەر ژ زارۆکینیێ یان بۆچی دروست کرد**

بەرێزان دڤێت دەست پێکێ بزانین خودایێ مەزن رەحمەک یا بمە مرۆڤا کری کوو ئەو رەحم ب مەلائیکەت و گیانەوەرا نەکریە ئەوژی ئەم یێ ئازاد کرین کا چ بکەین یان نە و مەلائیکەت نەشێن تاوانی بکەن بەلێ ئەم دشێین وە گیانەوەری عاقل نینە بەلێ مە یێ هەی و ئەم ئازادین کا چ بکەین .

خودێی عەقل یێ دایە مە و جهـ و هەر تشتێ مە پێدڤی یێ بۆمە دابین کری و پێغمبەری یێ بۆمە فرێکری و کتێب ژی یا بۆمە فرێکری دبێژیتە مە هوسا بکەن و هوسا نەکەن و بڤی شێوەی خودێی بنیاسن و رۆژا قیامەتێ سزا و پاداشت یا هەی دیڤ کریارێت هەووە ، و هین ل دنیایێ ب دلێ خۆنە کا چ بکەن یان نە .

خالەکادی ئەوە ئامانج ژ هاتنا مە بۆ ڤێ دنیایێ عیبادەت کرنا خودێی کوو عیبادەت گەلەک تشتا دگریتەڤە ، و دنیا یا کاتیە و ل چاڤ قیامەتێ چ حسێب نینە هندا کێمە و ئەم ل ڤێ دونیایێ یێ د تاقیکردنە ڤێ داینە کا دێ چ کەین و چ ناکەین ، و ئەنجامێ ڤان تاقیکردنەڤا رۆژا دوماهیێکە هەمی دێ ئەنجامێ خۆ وەرگرن .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئارمانجا مە ل ڤێرە چیە دروست بونا کەسێت وەکی ڤان دکتاتۆرا وەک تاقیکردنەکێیە بۆ مە مرۆڤا چونکی دەمێ کەسێت هوسا دروست دبن و تەمەنێ وانا یێ درێژە و خودێ ژ زارۆکینیێ وان ناکوژیت بۆ وێ چەندێ هەتا رۆژا دوماهیێ وان چ حیجەت نەمینن و نەبێژن خودێ پاتە بۆ تەمەنێ مە درێژ نەکر کی نابێژیت ئەم دا باشیێ کەین ماتوو ئەم ئازاد نەکربووین ، پا بۆچی تە ئەم ژ زارۆکینێ کوشتین و توو دبێژیەمە دەمێ هین مەزن بان دا خرابیێ کەن ؟ ئەڤە نەحەقیە توو لمە دکەی ، ژبەر ڤێ چەندێ خودێی تەمەنێ وانا درێژ کرد و ئازاد کرن دا چ حیجەتێ وانا نەمینن ل رۆژا دوماهێ .

و خالەکادی ئەو خەلکێ دبن دەستێ وان دکتاتۆرا دا دبن دوو بەش هندەک ژ وانا زولم یا هاتیە لێکرن بۆ واناژی تاقیکردنەڤەیە کا حەتا چ رادەیەکی دێ سەبرێ لسەر گرن ، یا دیارە خودێژی چەند مەتحێ وان کەسا دکەت یێ سەبرێ دگرن ، بەشەک دیژی ئەون یێ بەری هنگی زالم بوون و واناژی زولم دکر بۆ هندێ دا ئەوژی هەست بکەن کا زولم کردن چەندا نەخۆشە و کا دێ پەشیمان بنەڤە یان نە .

خودایێ مەزن دبێژیت : وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ ( ٤٢ )

ئەی پێغمبەرێ خودێی وسا هزر نەکەی کوو؟خودێی هاش وانا نینە ژ کار و کریارێت زالم دکەن ، براستی خودێ سزایێ وانا دێ پاش ئێخیت بۆ رۆژا دوماهی دەمێ چاڤێ وانا تێدا ئەبلەق دبن .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ل ڤێ ئایەتێ دیاردبیت،ئەم بخۆ هۆکار بۆ ڤان نەخۆشیا وشەرا و فەسادێ : ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ( ٤١ ) تاوان و خرابی یا دەرکەفتی هەمی سەر ئەرد وزەریاژی یێ گرتینەڤە ، ل ئەنجامێ ئەو گوناحێ خەلک دکەن دێ سزایێ وان گونەهە چێژن کوو دروست بونا شەر و کارەساتێت سروشتیە حەتا ڤەگەرێن سەر رێبازەکا پاک و خودێ ناسیێ

یەعنی سەبەب فەسادێیە ئەم توشی جەنگ و کارەساتێت سروشتی دبین ، و خودێژی دبێژیت فیتنە بهێزترەژ قەتلێ ، ئەم هەمی دزانین فەساد ژی فیتنەیە دناڤ مە دروست دبیتن

بۆ ئەو مەسەلا موسا و وی زانای هەرچەندە مە بەری نوکە بەحس ژێ کربوو بەلێ ب کورتی دێ بێژمەڤە ئەو بۆ چەند هۆکارا بوو دەمی زارۆک کوشتی .

ئێک ژ وان هۆ کارا بوو کوو موسا فێری صەبرێ ببیتن

یا دووێ بۆ وێ چەندێ بوو ئاخفتنا لسەر تشتەکی نەبێژیت کوو چ زانیاری لسەر نەبن .

ئەڤ مەسەلەیە ب دوور و درێژی من یا بەحس کری ل ڤی لینکێ خارێ

https://m.facebook.com/story.php?story_fbid=228508231004023&substory_index=0&id=223522831502563

**بۆچی ئەم خودێ دپەرسێین ؟ خودێ چ منەت ب مە هەیە هەتا ئەم بپەرێسین(عبادەتی بوو بکەین) ؟!!**

هەروەکی خۆدێ کەرەم کری و دقورئانا پیروز دا گوتی: وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالأِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ، ئایەتا ٥٦ێ سوڕەت الذاریات،واته ،و هەما من ئەجنە و مروڤ یێت چێکرین ژبوو هندێ دا من ب پەرێسن و عیبادەتێ من بکەن، ئەرێ بەس پرسیار ئەڤەیە بووچی؟؟

بەرسڤا ڤێ پرسیارێ چیە؟؟

دەمێ خودێ ئەم چێکرین ئێکەم تشت بۆ پەرستنێ نەبوو !!،چەوا پا ئەم بوو چ تشتی چێکرینە؟باشە دا پرسیارەکێ بکەین؟ بووچی خودێ گەردوون چێکر ؟؟بەرسڤ، چونکە دا

چێکریێن دیتر بکەتە دناڤ گەردونی دا !!،باشە دا بهێین سەر وێ پرسیارێ بووچی خودێ ئەم چێکرین؟؟ بێگومان دێ ب لوژیکی! بەرسڤێ دەم، باشە دەمێ نیگارکێشەک هندەک خەلکی کۆم دکەت و، وێنەگێ دکێشیت و نیشا ۆان ددەت،باشە بووچی نیشا وان دەت؟؟!!چونکە دا خەلک بزانیت ئەو نیگارکێشەکێ زیرەک و خودان شیانە !!، لەوا خودێ ئەم چێکرین دا چێکریێن خوە نیشا مە بدەت دا و بزانین خۆدایەکێ ب هێز و شیان و دەستهەڵات دارە....،من نەڤێت ڤی بابەتی درێژبکەم دا بچین سەر پرسیارا خۆە یا سەرەکی،

ئەرێ هین دزانن پەیڤا پەرستن (عیبادەت)

چیە؟؟واتە تو هەمی فەرمانێت خۆدێ بجهبینی !،و گۆهداریا هەمی فەرمانێن خودێ بکەی،دا نمونەکێ ژی ل سەر ڤێ چەندێ بوو هەوە بینم ،دووبارە بەرسڤ ب لوژیکێ !!،تو ل قوتابخانێ هەمی ئەرکێن ل سەر ملێ خۆە

ب جهـ دئینی،بووچی دا تو چ بدەستڤەبینی؟؟

بێگۆمان دێ بێژی دا دەربچم و بچم زانکۆییێ و

و زانکوییێ ژی تمام بکەم و هەتا دبم دکتور !،

باشە ماموستایێن تە منەت ب تە هەیە تو ببی دکتور یان نە؟؟بەرسڤ،نەخێر منەت ب تە نینە !!،ئێ پا باشە دەمێ ئەم پەرستنا خودێ دکەین ژ بووچیە؟؟ژبەرهندێ یە دا بچین بەهەشتێ،واتە خۆدێ منەت ب من و تە نینە ئەم پەرستنا وی بکەین یان نەکەین،بەلێ خودێ فەرمانێ ل مە دکەت و هندە ئەرک و کارا ددانت سەر ملێ مە ئەگەر ئەم ب جهـ نەئینین دێ هێینە سزادان، ل قوتابخانێ ژی ئەگە تو ئەرکێن خۆە ب جهـ نەینی دێ ماموستا تە سزادەت یان نە؟؟(تو ژ پولا خۆە دەرناچی)ئێ مانێ ماموستایان چ منەت ب من و تەنەبوو!!، دڤێت تو ل دەستپێکێ خۆدێ بنیاسی ژنوی وی دەمی دێ پەرێسی،هەر کەسەکێ پێتڤی ب خودایەکێ هەیە بپەرێست چونکە مروڤ بخۆە پێتڤی یە نەک خۆدێ !، بوو نمونە گەلەک خەلک یێ هەی پەیکەرا بوو خوە چێدکەت و دکەتە خودایێ خۆە و دپەرێسیت ،بووچی دپەرێست؟؟چونکە سرۆشتێ مروڤی یێ هوسایە!! کو پێڤی ب کەسەکی هەیەداخازا هاریکاریێ ژێ بکەت و ب پەرێسیت و عیبادەتی بوو بکەت. !!،

## بەرسڤا پسیارەکا ملحدان ... موسلمان مشغول کرن...

بەرێزان.. بەرسڤ دانا موشرکا و کافران هند تشتەکێ مەزن نینە ، بەلێ یا ژ لایێ من مەزن .. ئەوە موسلمان گووتنێن کافر و بێ باوەرا دووبارە بکەن، و گومانێ ژ ئیسلاما خوو ب بەن، ئەڤەژی زور کارەکێ ئاسانە بوو وان کەسان یێ ئاینێ خوو سادە وەرگرتی، د ڤێرێدا ئەس یێ دلنیا مە ، ئەگەر تە باوەری هەیە ئەڤ ئاینە ژ لایێ خودای مەزنە ، شەرمبکە ژ هندێ کۆ تو ب گومان بەرێخووبدەیێ ، ئەگەر دینەك ژ لایێ خودێ بیت دلنیا بە بێ کێماسی (نوقصات)ە

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

**دا بێینە سەر پسیارێ ئەوا ملحد د کەت و هزرا موسلمانی مشغول دکەت.....**

**ئایا خودێ ژ نیڤا شەڤێ دهێتە سەر ئەردی کو ژ نیڤا دی یاتر روژە ...؟!**

د راستی دا ملحدێ ڤێ پسیارێ دکەت حەقێ وییە ئەم بێژین گەلەکێ ئەحمەقە د کرنا پسیارا خوو دا ....

چارێ هەر ب ئەقلێ خو بەرسڤا ڤێ پسیارێ...

ژ رویێ لوژیکی ڤە دێ پسیار ژ هەبوونا خودێ کەین ، ئەگەر خودایەک خودا بیت و ژ هەژی پەرستنێ بیت، ل نیفا شەفێ دا ئەگەر بەندەیەک داخازیەکێ ژێ بکەت، ب دلنیا دێ چیتە لایێ وی بەندی و سکالا و داخازیا وی وەردگریت، نە بتنێ ئاگە ژ وی بەندیە بەلکو هاش هەمی بەندێن خوو هەیە د دەمێ شەڤێدا، د هەمان دەمدا دڤێت ئاگە ژ بەندێن دی هەبیت ل نیفا دیا سەر ئەردی روژێ، ژ بەرهندێ ناڤێ وی خودایە ، بویە د بێژینێ خودا و د پەرێسین د ڤێت ژ سیڤەتێن مخلوقی جودا بکەین،...

دا بهێینە ناڤەروکا پسیارا زور لاواز ..

باشە ئەس دێ بێژم کەسەک ل نیڤا شەڤێ ل دەمێ ئارامیێ و بهێن فەدانێ داخازیەکێ بو خودایەکی ب بەی، ئەرێ ئەو خودایە چەندێ مەزنە ل پێش وی بەندی، ....

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دڤێرێدا ناخێ گەندەڵ و فاسقیا مولحدان بو مە دەرکەڤیت، چونکە د ناخێ خودا پیس و نە دادپەروەرن هەمی گووتن و سحبەتێن وان ل سەر بنەمایەکێ اقل گەنی و کورتن،هوسا هزر دکەن کو خودێ ل دیڤ کەس ناجیت هەکە خودێ توانای ژی هەبیت تەمبەل و بێ تاقەتە .تاقەتی ژ کیڤەیە کو بدیڤ عبدێ خو بچیت دەمێ ل خودێ دوعا دکەن د شەڤێ دا.،،، ملحد د بێژن خودێ نینە، ماکوان ژی د بێژیتە ملحدی توو ب خودێ تو عەیب ناکەی پسیار ژ تشتەکی دکەی و تە باوەری ب هەبونا وی تشتی نینە، مولحد د بێژیت اخر من دڤێت بێژم خودێ بوونی نینە، ئەس بانگەشا هندێ دکەم خودێ نینە.!

ئەم ژی دێ بێژین مادەم هوسایە ل دەستپێکێ پسیارا تە نە معقولە ، وەرە جارێ دا ب سەلمینین کا خودێ هەیە یان نە،

ئەگەر هەبوو ئەو خودایە و سیفەتێن خودای ژ مخلوقی چێوازە توانا و هێزا بێ سنور هەیە، ئەگەر نەبوو ، توو دڤێت ب بەڵگا بێژی کو خودێ نینە،! ... موستەحیلە ل سەر فێ دنیایێ زور کێم کەس هەنە بشێن بەحسی نەبوونا خودێ بکەن، خەلکەکێ زور شاز هەیە بەحسی نەبوونا خودێ بکەت، ل سەر هندێ را دێ چیتە دروست بونا گەردونی و مروڤ و هەمی هەبوونا، نەچار د بیت دێ چیتە ناخێ خۆ یێ درەوین و دێ بێژیت: خودایێ رێکەڤت یان خودایێ سروشتی یان خودایێ فەواز، ئەڤ هەبوونە یا دروستکری و هێز د زڤریت بوو ماددە کە ئەوژی جورێکە ژ خودا، د هەر حالی دا ملحد د بەردەستێ من نینە ، دا بزانم ژ کیفە د ئاخڤیت و د گوتنێن خودا یێ چەوایە،.....

بەلێ گوتنەک بو موسلمانان دبێژم ..

خودێ ئیک ژ سیفەتێن وی ڕاگرێ دەمیە واتە (باسط)ە، و خودایێ مەزن (محیط)ە واتە چوار دەورێ هەمی مخلوقی دایە، و (قابض).... باشە دڤێت موسلمان توو بزانی خودێ ژ دروستکەران ناچیت، تو پێناسا خودێ د زانی ژ قورئانێ و پێغەمبەری(د.خ) ، هیچ مەخلوقەک وەک نینە...

و دبێژیت (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِير) ئیتر توو جەوان پیڤەر دکەی و تە د ڤێت جەوان بینیە بەر جاڤێن خوو...! مروڤێ موسلمان و پاش ئاقل و تێگەهشتی بەحسی هەر چ بوو بکەی ، پێشتر وێنە دیتیە.... یان وەسف یا بوکری، بونمونە دێ بێژین موبایل وەسف و پێناسەکا دیار یا هەی، و بێژیت تلەڤزیون وە یا دیتی و دشێین وێنە بکەین، تە بخو نەدیتیە گوتنەک بناڤێ ئیمان دار، و د بێژین مروڤێن ئیمان دار ، جەوا دێ چێبیت خودایێ خوو ب ماددەی دەستنیشان بکەین؟ ل وی دەمی دێ وەکی مروفێن دەرچیت و بیتە مروفێ ماددی، خودایێ مەزن د قورئانێ دا بەحسی مروڤێ ئیماندار کریە و دبێژیت باوەری غیبیاتێ هەیە و ب رێکا قورئانی د بێژیت [ الذين يؤمنون بالغيب ويقيمون الصلاة..]

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

**پرسیار:-کەسەکێ پرسیار کر بوو دگوت خودێ ل قورئانێ دا سورەت التین لاپەرە ٥٩٧ ئایەتا٤ دبێژیت{لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم} رامان:- بێگومان مە مروڤ ب جوانترین شێوە دروست کریە}}وێنەیێن کێم ئەندا مەکێ ڤرێکریە یان کەسەکێ دوو سەر یان نەیێ تەواو یان دوو کەسان لەشێ وان پێکڤەیە...**

بەرسڤ:-الحمد الله رب العالمین وسلام علی محمد رسول امین و علی اله اجمعین...

وەکو یا دیار هەر ل سەر دەمێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن و هاتنە خوارا قورئانێ گەلەك دوژمناهی و دژاتیا ڤێ قورئانێ هاتیە کرن ژلایێ مولحید و قەشەو کەنیسان ڤە، وەکو دیار ڤێجارێ هاتینە و رەخنێ ل کیتابەکێ بگرن کو خودێ هەر ل ئایەتا ٢ سورەت البقرە دبێژیت{ذالك الکتاب لاریب فیە}ئەڤ پەرتوکە کو چ شك و گومان تێدا نینە،وەکو ئەوی مرە ملحیدی گوتی خودێ دبێژیت{لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم}دێ بێژین مەرە مولحید تو هێشتا ج ل قورئانێ و یاسایێن وێ نزانی،{لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم..ای:تصمیم}ئانکو مە مروڤ ب جوانترین شێوە یێ جێکری{دیزاین کری ژلایێ لەشی ڤە٠}بونمونە دفنا مروڤی ل سەر دەڤێ مروڤی یە چونکە دەمێ ئەم خوارنەکێ دخوین دا بێهنا وێ بکەین پاشی بخوین جونکی ئەگەر خراپ بوو دانە خوین دوو دەست ئەگەر سێ بان یان چوار بان دا مروڤ یێ چاوابیت،،،ئایەت دبێژیت مە مروڤ بارا پتر ب جوانترین شێوە دروست کریە

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

..نەسروشتیا زاروکان بەری بوونێ ل زکێ دەیکێ دا ئەڤە دەستکاریا مروڤانە، ئانکو ئافرەتەك هەیە دەرمانان بکاردئینیت ئەڤ دەرمانە کاریگەریێ ل سەر زاروکی دکەن د زکێ دایکێ دا، یان ژی ئەو گەلەك خوە زەحمەت ددەت کارێن گران دکەتن یان روینشتن و ڕابین و نڤستنا وێ خەلەتە، ژبەر هندێ هندەک زاروک نەسروشتی ژدایک دبن.

نمونەکا واقعی:-ئەگەر ئەم بێژین خەلکێ دهوکێ د زەنگینن ئایا فەقیر تێدانە؟؟وەلام بەلێ بەس بارا پتر ژ خەلکی د زەنگینن..

یان گەلەك جاران مە گوهلێ بویە خەلکێ مە دبێژن:- عەرەب دپیسن و مەژی هشکن،ئایا عەرەب هەمی دپیسن و مەژی هشکن؟؟وەلام نەخێر چونکە وان ژی کەسێن جامێر و باش

و ب عاقل هەنە،

یان ئەگەر بێژین:- کورد موسلمانن ئایا هەمی موسلمانن؟وەلام نەخێر مەیێن هەین ئێزدی و فەلەو...هتد}ڤێجا مەبەستا قورئانێ ئەوە کو مە مروڤ بارا پتر ب جوانترین شێوە دروست کریە...التقویم ای بمعنی التصمیم ئانکو دیزاین..

ئەگەر ئەڤە وەسا نەبیت، دابهێینە سورەت الفرقان لاپەرە ٣٦٢ ئایەتا٣٠ دبێژیت{وقال الرسول یربی ان قومی اتخذوا هذا القرءان مهجورا}ئانکو:- ل روژا قیامەتێ دا پێغەمبەر سلاڤ لێبن دێ شکایەتێ کەت بێژیت یارەبی قەومێ من مللەتێ من ئەڤ قورئانە یا هێلای پشتا خو یادایێ...

پرسیار:- ئایا هەڤالێن پێغەمبەری سلاڤ لێبن قورئان هێلابوو،؟؟پشتا خۆ دا بوویێ؟؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

چەند کەسان ڤێگاڤێ قورئان ژبەرە زوور کەسان،، بەس مەبەستا ڤێ ئایەتێ ئەوە..

پتریا یان پڕانیا مللەتێ من{ژئومەتا محمدی} سلاڤ لێبن، قورئان هەجر کریە یان پشت دایێ،

ئەگەر بەرێ خوبدەینە مێژوییێ ل سەر دەمێ یان پشتی هەر چوار خەلیفێن ئیسلامێ چوین و مرین پشتی وان وهەتانوکە و هەتا قیامەت رادبیت جەند کەس ل دینی دەر کەفتن یان قورئان هێلا و هەجر کر ....

بەس بو عەقلێ مولحیدان:-باشە تو بوجی نا بەرێ خودە یە ئەڤان هەمی مروڤان کا جەند جوان دروست کرنە خودایێ من،

ئەو رێژا تو دبێژی زوور یاکێمە دناڤ دونیایێ دا،،

## موسلمانان کەعبێ دپەرێسن :-

پرسیار:- ئەگەر موسلمانان دژی بت پەرستی بن .ئەرێ بوچی موسلمانان سوجدە بۆ کەعبێ دبەن و ل نڤێژا خۆ دا دپەرێسن؟

بەرسڤ:-کەعبە قیبلەیە.یان ژی ئەو رووگەیە کو موسلمانان ل دەمێ نڤێژێ بەرێ خۆ د دەنێ .بەلێ ئەو ژی پێتڤیە بزانن کو موسلمانان بەرێ خو دەنە قیبلە و نڤێژێ دکەن مانا وێ نینە کو کەعبە پەرستن .موسلمانان ژبلی (الله)سوجدە بۆ هیچ کەسەکێ دی نابەن و نا پەرێسن. ئەڤە ژی ل ئایەتەکێ سورەت (البقرة)دیارکریە کو خودایێ مەزن دبێژیت(قَد نَرَی تَقَلُّبَ وَجهِكَ فِی آلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِیَنَّكَ قِبلَةَ تَرضَاهَا فَوَلِّ وَجهَكَ شَطرَ آلمَسجِدِ آلحَرَامِ وَحَیثُ مَا کُنتُم فَوَلُّوا وُجُوهَکُم شَطرَهُ وَاِنَّ آلَّذِینَ أُتُوا الکِتَابَ لَیَعلَمُونَ آنَّهُ آلحَقُّ مِن رَّبِّهِم وَمَا آللهُ بِغَافِلِ عَمَّا یَعمَلُونَ) (البقرة -١٤٤)

١:-ئیسلام بانگەشەیا ئێکریزی و ئێککرتی دکەت:-

هوسا دانە دەمێ موسلمانان نڤێژی دکەن.رەنگە موسلمانەک بڤێت بەرێ خۆ بدەتە باکوور و موسلمانەکێ دی بدەتە باشوور .ب ڤێ چەندێ گرژی و نەخوشی دناڤ موسلمانان بەلاڤ دبیت ڤێجا بۆ پاراستنا ئێکڕیزی و ئێکبوونا موسلمانان ل بەندایەتی کرنا خودێ.موسلمانان هاتنە داخازکرن کو ل هەر جهەکێ بن بەرێ خۆ بدەنە ئێک رووگە کو ئەو ژی کەعبەیە.هەر ژبەر ڤێ چەندێ ئەو موسلمانێ ل روژئاڤا دژیت بەرێ خو دەتە روژهەلات کەعبە وبەروڤاژی ئەو موسلمانێ ل روژهەلات دژیت بەرێ خو دەتە روژئاڤا کەعبە.

٢:-کەعبە دکەڤیتە چەقێ نەخشا زەڤی.

موسلمانان یەکەم کەس بوون کو شیان نەخشا جیهانێ بکێشن.ونەخشە بڤێ شێوێ هاتە کێشان کو باشوور ل سەرڤە و باکوور ل خارڤە.وکەعبە دکەڤیتە ناڤەراستێ نەخشە.لدیڤ دا نەخشە کێشێن روژئاڤا هاتن ونەخشەکێ دی کێشان کو بڤێ شێوێ بوو . باکوور دکەڤیتە سەرڤە و باشوور دکەڤیتە خارڤە لێ بەلێ دکەل وێ گورانێ ژی هەر کەعبە ل ناڤەراستێ نەخشە مایەڤە.

٣:-زڤرین ل دوور کەعبێ ئاماژەیە بۆ هەبوونا خودایەکێ تاک و تەنها :-

دەمێ موسلمانان دچنە(مسجد الحرام)ل مەککە.کو موسلمان رادبن بزڤرین ل دوور کەعبێ. ڤێ کارێ وەک هێمایەک یان ژی ئاماژەیەک دهێتەدانان کو ب هەبوونا خوادیەکێ تاک و تەنها.چنکی هەر وەک چاوا هەمی بازنە ئیک چەق هەیە .ب هەمان شێوە ژی تەنها ئیک خودێ هەیە کو هەژی پەرستن بیت ئەو ژی زاتێ (الله)یە.

٤:-فەرموودا ئیمام عومەر(خودێ ژێ رازی بیت):- ئەوا دەربارا "بەردا رەش (الحجر السود)"ل سەردەمێ پێغەمبەر(س.خ).روودانەک هەبوو کو ئیمام عومەر بەشەک بوو ل وێ رویدانێ.

ل سەر حەدیسێ (الصحیح البخاري)بەرگێ دووێ بابەتێ حەج بەشا(٥٦)فەرموودا ژمارا (٦٧٥)کو رویدانەک بڤێ شێوێ رویدایە.

دەمێ ئیمام عومەر.پێغەمبەر (س.خ)دیت کو بەردا ڕەش ماچ دکر .کو ئەو ژی چوو پێشیا بەردا ڕەش و کوت (ئەز زانم کو تو بتنێ بەردەکی و نەدشیی مفا بگەهینیە من و نەدشیی زیان ژی بگەهینیە من) و ئەگەر من نەدیتبا کو

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

پێغەمبەر (س.خ)دەستێ خو ب تە ئینایە و ماچی تەکریە. ئەوە ب هیچ شێوەکێ من دەستێ خو ب تە نەدئینا ومن ماچی تە نەدکر.

٥:-خەلک ل سەر کەعبە راوستاین و بانگ داینە :-

ل سەردەمێ پێغەمبەر (س.خ) هندەک کەس هەبوون کو ل سەر کەعبە راوستاین و بانگ داینە .دبیت کەسەک هەبیت کو پرسیار بکەت و موسلمان ب پەرستنا کەعبە تومەتبار بکەت.باشە چ بت پەرستەک هەیە کو ل سەر ئەو بتا دپەرسێسیت راوەستیت.

## دروست بوونا زاروکی دناڤبەرا زانستی و فەرموودا صەحیح دا

ئەڤ فەرموودەیە ئێك ژوان حەدیسا یە ئەوێن ملحد و نەیارێت سوننەتێ (قورئانیون) دژایەتیێ دکەن و دبێژن لدژی زانستی یە ، دڤی بابەتی دا ئەم دێ دیارکەین کا ئەرێ ئەڤ گوتگوتکێت وانا ڕاستن یانە نە؟ و ئەم دێ ئاخفتنێت وانا ئینین و رەدێ لسەر دەین رەدەکا زانستی ، لدەسپێکێ دڤێت بزانی کو ئەڤ حەدیسە ب دوو شێوازا یا هاتی جارەکێ بەحسا دیارکرنا رەگەزی دکەت (نێر و مێ) و جارەکێ بەحسا پێڤەچونی دکەت کا بچیك دێ زیدەتر بکێڤە چیت گەلەك کەس جێوازیێ دناڤبەینێ دا ناکەن لەوما خەلەتدبن.

فەرموودا ئێکێ و ئەوا بەحسا رەگەزی دکەت:

قال جئت أسألك عن الولد قال « ماء الرجل أبيض وماء المرأة أصفر فإذا اجتمعا فعلا منى الرجل منى المرأة أذكرا بإذن الله وإذا علا منى المرأة منى الرجل آنثا بإذن الله ». صحيح مسلم ٦٤٢

فەرموودا ئێکێ و ئەوا بەحسا پێڤەچونێ دکەت:

قال نبى الله -صلى الله عليه وسلم- « نعم فمن أين يكون الشبه إن ماء الرجل غليظ أبيض وماء المرأة رقيق أصفر فمن أيهما علا أو سبق يكون منه الشبه ». صحيح مسلم ٦٣٦

ڕاڤەکرنا فەرموودا ئێکێ:

مولحدەك دبێژیت:

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئانكو " ئــاڤا زەلامی سپیــە و یا ژنكــێ زەرە ، ئەگەر د دەمێ جوتبونـێ دا ئاڤا زەلامی ژ یا ژنێ پتر بوو دێ زارۆك (نێڕ) بیت ، و ئەگەر ئاڤا ژنــێ پتر بوو دێ زاروك (مێ ) بیــت " .ژ لایێ زانستی ڤی د واقع دا دروستـبوونا جورێ رەگەزێ زارۆكی ژئەگەرێ جورێ وان كروموسومانە یێن كو هاتینە هەلگرتن ژ لایــێ سپێرمی ڤە ، كروموسومێ ئێكس (X) مــێ یە و كروموسومێ ( y ) نێرە ، ئەڤە د حالەتەكێ دا كو هێكێــن ژنكێ هەمی گاڤا هەلگرێ كرۆموسومێن جورێ (XX) ە ، و یێـن زەلامی ژ جورێ (XY)یە .. ئــەگەر هات و ددەمێ جوتبوونـێ دا كروموسومێ ( y ) یێ زەلامی دگەل (X) یا ژنكێ هەڤگرتن دێ بیتە (XY) و زارۆك دێ ( نێڕ) بیت ، بەلێ ئەگەر كروموسومێ زەلامیێ یێ (X) دگەل دگەل كروموسومێ ژنكێ یێ ( X) هەڤگرت ل وی دەمی دێ بیتە (XX) و دێ زارۆك ( مێ ) بیت ..ئانكو دیاركرنا رەگەزێ زارۆكی چ پەیوەندی ب هەبوونا رێژەیا ئاڤێ ڤە نینــە كا كیش پترە ، بەلــكو یا ب یەككرتنا كرموسومان ڤە هەی .

.

بەرسڤ:

١- ژلایێ زمانیڤە پەیڤا ئاڤ نە بتنێ بمەعنا ئاڤا ژنكێ و زەلامی دئێت برەنگەكێ گشتی .. بو هەر تشتەكی دئێت دناڤ وێ ئاڤێ دا بیت یان سیفەتێ ئاڤێ هەبیت ...بەلێ دیارە وانا دڤێت لوی سەردەمی ئەڤ فەرمودە یا بڤی رەنگی بایە دا شنی باوەركن كو یا راستە ! گوتبا ( كروموسم الرجل Y و كروموسوم المراة X فاذا على كروموسوم رجل على المراة صارت ذكر ...الخ) مەعقولە؟

٢- دیسان ژلایێ زمانی ڤە یا ژوانا (علی – علو ) رامانا وێ (پتر)ـە ! ..ئەڤ چەندە ژی خەلەتە چونکی (علی – علو) د قورئان و حەدیسێ دا ب مەعنا زالبون و بلندبون و گەلەك مەعنەیێن دی ئێن کو د رستێ دا دیاردبیت.

ئیمام ابن حجر دبێژیت: لڤێرێ مەبەست ژ (علو) زی گەهشتنە، و هەر زی گەهشتنەك ژی زالبونە و هەر زالبونەك (علو) ژی هاتبیت مەعنەوی یە.

والمراد بالعلو هنا السبق، لأن كل من سبق فقد علا شأنه فهو علو معنوي. (فتح الباري شرح صحيح البخاري)

٣- مەعنەیا دروست یا ڤێ حەدیسێ ئەوە کو ئەڤ حەدیسە دوو پارچە یە ، لدەسپێکێ حەدیسێ بەحسا ئاڤێ کریە (ماء) پشتی هنگێ بەحسا توڤێ زەلامی (مني) کریە .

ئانکو دڤێت بڤی رەنگی بیت (ئـاڤا زەلامی سپیـە و یا ژنکـێ زەرە ، ئەگەر د دەمێ جوتبونـێ دا توڤێ زەلامی بسەر توڤێ ژنێ کەفت دێ زارۆک (نێر) بیت ، و ئەگەر توڤێ ژنـێ بسەر توڤێ زەلامی کەفت بوو دێ زاروک (مێ ) بیـت )

ژلایێ زانستی ڤە هێکا ژنێ یا زەرە:

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤە وێنێ وێ یە:

slide1

http://news.bbc.co.uk/1/hi/health/7447942.stm

A1CD7B94-٠٠٤-٩٤٩٣٠

http://kids.britannica.com/kids/assembly/view/89498

٤- هەروسا ناڤێ ئاڤ بو بكارهاتیە چونكی زوربەیا هێكێ ژ ئاڤێ پێك دئێت:

This is important because the female egg cell is primarily made of water.

http://uscfertility.org/egg-freezing/

٥- پارچا دووێ یا حەدیسێ بەحسا زالبونا توڤێ نێر و مێ دكەت و ناڤێ (مني) بو بكارهاتیە و مني بتنێ یێ زەلامی یە ئانكو توڤێ زەلامی دوو سیفەتا دهەلگریت سیفەتێ نێر Y و مێ X .. دەمێ ئەو هەمی كرمێن دناڤ توڤی كو ب ملیونەها توڤن سیباقێ دكن ئەگەر توڤەكێ نێر زالبو و گەهشتە

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هێکا ژنێ دێ بچیك نێر بیت و ئەگەر یێ مێ گەهشتە هێکێ دێ بچیك مێ بیت:

ئەڤ ئایەتێن هەنێ ژی وەکی ڤێ فەرموودەیێ ڤێ رامانێ ددەت :

سورة النجم ٤٥-٤٦ : وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ * مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ.

سورة القيامة ٣٩ : فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى.

ڕاڤەکرنا فەرموودا دووێ:

د فەرموودا دووێ دا بەحسا پێڤەچونێ هاتیە کرن

قال نبى الله -صلى الله عليه وسلم- « نعم فمن أين يكون الشبه إن ماء الرجل غليظ أبيض وماء المرأة رقيق أصفر فمن أيهما علا أو سبق يكون منه الشبه ». صحيح مسلم ٦٣٦

ئانکو : چەوا پێڤەچون چێدبیت، ئاڤا زەلامی یا تیر و سپی یە و ئاڤا ژنێ یا تەنك و زەرە، کا کیژك زالبو و بەریکێ کەفت دێ پێڤەچون چێبیت.

لڤیرێ دڤێت مروڤ بزانیت کو زالبون مەعنەوی یە و بەحسا وان سیفەتا یە ئەوێن دناڤ ئاڤا وان دا ، و یا دیارە ژی کو لدیف وان کروموسومێن دناڤ ئاڤا وان دا زالبون چێدبیت ، چونکی دڤێت مروڤ بزانیت ژنێ دوو X یێت

هەین، لەوما دوو جور مێ و دوو جور نێر چێدبن، نێرەك پتر سیفەتێن دەیکێ وەردگرت و نێرك پتر سیفەتێت بابی هەروسا یا مێ ژی ، لەوما لڤێرێ لدیڤ زالبونا سیفەتا دمینت و کا کژ کروموسوم دێ زال بیت لسەر یێ دی و ژوان چار سیف

## ئایا خودێ (الله) نێرە یان مێیە ؟

باشە بوچی قورئان (هو) بکاردئینیت مادەم خودێ نە نێرە؟

وەکی د قورئانێ دا هاتی (قل #هو الله احد)

د ئیسلامێ دا خودێ رەگەز نینە، نە نێرە و نە مێ ، و ج کەس وەک خودێ نینن .........

ئەگەر بێژین خودێ نێرە دڤێت ل وی دەمی یەکسان کەین دگەل نێری**!** و ئەگەر بێژین مێیە یەکسان بیت دگەل مێی .....

بوچی ب عەرەبی د بێژیت د ئایەتا قورئانێ دا (قول هو الله احد ) ، وەکی د زانین (هو) د عەرەبیێ دا بو نێری ب کاردهێت ، .......

باشە وەکی د زانین جەند مەرج هەنە کوو رەگەز نێر بیت یان مێ ؛

مەرجێ ئێکێ :- ئەگەر بێژین خودێ مێ بیت ، وەکی د سروشتی دا دەیك و خویشك مێنە ، ئانکو خودێ ب سروشتێ مێ نینە ....

مەرجێ دووێ :- دڤیا با خودێ جووت با ، بەلێ جووت نینە ، وەکی د قورئانێ دا هاتی (قول هو الله احد) واتە خودێ ئێکە، ...

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

و مەرجەکێ دی هەیە دفیابا ل دووماهیا ناڤێ خودێ (الله) ب بیتا (ئەلیف) ب دووماهیک هات با، بەلێ پەیفا (الله) ب پیتا (ئەلیف) ب دووماهیک نەهاتیە، .....

خودێ دشێت(هو یان هی ) بکاربینیت بەلێ ب پێی سروشتێ زمانی ژ هەژی (هو) یە ، بەلێ خودێ ب سروشتی رەگەز نینە.

د زمانێ ئینگلیزیێ دا (God) بوو خودایێ نێرە و (Goddess) بوو خودایێ مێیە، د عەرەبیێ دا رەگەزێ بێ لایەن نینە، ژ بەر وێ چەندێ خودێ ب رێسایێن رێزمانا عەرەبی (هو) بوو نێر بکار دهێت ، بەلێ خودێ چ رەگەز نینن .....

دا ژ بیر نەکەین خودێ ل قورئانا پیروز ل سورەتا الشوری ل ئایەتا ١١ دبێژیت( لیس کمثله شئ ) واتە چ تشت وەک من نینە،..

واتە ژ بەر رێنما و رێسایێن رێزمانا عەرەبی (هو) هاتیە بکارئینان ، بەلی خودێ رەگەز نینە ....

## هژمارا درست یا هەڤالێت شکەفتێ (اصحاب الكهف) چەندە ؟

ئەرێ ما خودێ یێ ب گومانە ژ هژمارا وان؟C٭□

هەتا دوماهیێ بخینە دا بزانم زەحمەتا من نە ژڤەستا یە

ئایەتا ٢٢ ژ سورەتا الكهف دبێژیت :-

( سيقولون ثلاثة رابعهم كلبهم ويقولون خمسة سادسهم كلبهم رجما بالغيب ويقولون سبعة وثامنهم كلبهم قل ربي أعلم بعدتهم ما يعلمهم إلا قليل فلا تمار فيهم إلا مراء ظاهرا ولا تستفت فيهم منهم أحدا )

لڤێرێ دا کەسێ بێدین یان دژە ئیسلام دێ اصرار کەت چەند کەسن ؟

ئەرێ ما خودێ نزانیت چەند کەسن ؟

دا دەست ب بابە تی بکەین و ڤێ گومانێ ژناڤ ببەین

عەزیزان لڤێرێ بشێوەکێ زورێ بەلاغی خودای هژمارا وانا یا دیارکری ، دگەل من بە :-

دئایەتا ١٩ سورەتا الكهف دا هاتیە :-

( وكذلك بعثناهم ليتساءلوا بينهم قال قائل منهم كم لبثتم قالوا لبثنا يوما أو بعض يوم قالوا ربكم أعلم بما لبثـــتم...)

(فێجا ئاها ب وی شێوە ی مە نڤاندن داکو پسیارێ ژ ئێکودوو بکەن،ئێکی ژوانا گووت ئەم  چەند ماین [ئەم چەند ماینە نڤستی] هندەکا گوت روژەك یان کێمتر ، هندەکا گوت خودایێ مە زاناترە کا چەند نڤستن )

دا ب دیقەت سەحکەینە ڤێ ئایەتێ و دا بەلاغەتا قورئانێ ببینین

ل دەسپێکێ دبێژیت (قال قائل منهم ) ئانکو کەسەکی وەگوت

١ نوكه ئەو ١ كەس

پاشی دبێژیت (قالوا لبثنا)واته كومەلەكا مروڤا گوت

لڤێرێ دا (واو الجماعة) یا بكارئینای

ئەڤ (واو)ـه بو ٣ كەس و پتر دهێت دزمانێ عەرەبی دا

واته لڤێرێ ٣ كەسا یا ئاخفتی

٢: ئەو ٣ كەسێت دی

نوكه بو نه ٣+١=٤

هەتا ڤێرێ بەحسا ٤ كەسا كر

پاشی ڤان ٣ كەسێت گوتین (لبثنا) ئاخفتنا وان خلاس

٣ كەسێت دی بەرسڤا وان دا و گوتن (قالوا ربكم..)

ئانكو :-

دڤێرێ دا ئەو كەسێت بەرسڤا وان دای نه هەر ئەو كەس بوون یێت گوتین (لبثنا یوما او بعض یوم ) چنكی (واو العطف ) بكارنەینایه و نەگوتیه (وقالوا ربكم ) یاگوتی (قالوا ربكم) واته وان ٣ كەسێت دی ئاخفت

ویا گوتی (قالوا ربكم اعلم بما لبثتم) یا گوتی (لبثتم) ئانكو (تم) یا مخاطبی یه

٣: ئەو ٣ دی ژی ئانكو ١+٣+٣=٧

نوكه مەزانی ٧ كەسن دا بچینه سەر ئایەتێ و دگەل من به

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دبێژیت :-

(سیقولون ثلاثة رابعهم كلبهم)

ئەفجا دێ هندەك بێژن سێ نه و یێ چارێ صەیێ وانایه

بەلێ ئاگەهداربن خودایێ مەزن لڤێرێ ئاخفتنا خەلکی نیشا مە دەت و نەقل دکەت و خودا فان هەرسێ گوتنییێت جیاوازژی دیاردکەت کوجرەبر سەر دهاته کرن

پاشی دبێژیت :-

(ویقولون خمسة سادسهم كلبهم)

هندەکێت دی دبێژن پێنجن و یێ شەشێ صەیێ وانایه

پاشی دبێژیت :-

(((((رجما بالغیب)))))

ئانکو ئەو ئاخفتنه دبێ واتانه و تڤەنگێ دتاریێدا ددانن

ئو هەردو ئاخفتنیت سەری کوگوتین ٣،٤ ن خودا دبێژیت هوسانینه و وشا (رجما بالغیب ) بو بخەلەت دیارکرنا وێ بکارئیناتیه

ئەرێ پا ده ڤیقەن چەندن ماخودای دیارکریه ؟

دگەل من به

خودا ٣ ئاخفتنا فەدگوهێزیت یێت سەرزارێ خەلکی

١: یا ئێکێ (سیقولون ثلاثة رابعهم كلبهم)

٢: یا دووێ (ویقولون خمسة سادسهم كلبهم)

خودا ڤان هەردوو ئاخفتنا انكار دكەت بپەيڤا (رجما الغيب)

٣: يا سيێ (و يقولون سبعة [[ و ]] ثامنهم كلبهم)

بوچی خودايی ئەڤ واو ە ئێخستيە پشتی (ثامنهم) ؟؟

عەزيزان ئەو واو ە واو التحقيقة كو وی كاری جەخت دكەت و دكەتە دنياى و درستی

ئانكو ئايەت دبێژيت :-

حەفتن بدلنياى و يێ هەشتێ صەيێ وانايە

لەوما خودا دبێژيت :-

قل ربی اعلم بعدتهم

وخودا هژمارا وان دزانيت نەک ئەويت گوتين سێ و پێنجن

## بۆچی قورئانا پیرۆز ب زمانێ عەرەبیە ؟

كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ( ٣ )

کتێبەکە ئایەتێت وێ ب تەفصیلی ب ئەمر و نەهی ئامۆژگاری رێکی نیشا مەددەت یادا خودێی و حوکمێ شەرعی و بابەتێن دیکە ب زمانێ عەرەبی دهێتە ڤەخاندن بۆ وان کەسا یێ خودانێ هزر و هۆشانە . فصلت : ٣

إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ( ٢ )

ب راستی مە کتێبەک یا ئینایە خارێ کوو قورئانە ب زمانێ عەرەبی حەتا هین لێ تێبگەهن و بزانن . یوسف ٢

گەلەک جارا ئەم ڤێ پرسیارێ دکەین بۆچی قورئان ب عەرەبیە بۆچی ب کوردی نیە یان ب سۆرانی نیە یان ب بادینی نیە یان ب فلان عەشیرەتا من نیە حەتا ئەز تێبگەهم ، ئەرێ براستی بۆچی قورئان ب عەرەبی یە ؟؟

بەرسڤا ڤێ پرسیارێ گەلەکا ساناهیە پێغمبەرێ مە محمد صل الله علیه وسلم ب رەگەز عەرەب بوویە و دناڤ عەرەبا بوویە و یێ هاتیە هەلبژاردن ، بێ شک دڤیابا قورئان ژی ب زمانێ عەرەبی با حەتا پێغمبەر و قەومێ وی لێ تێگەهشتبان ، معقول نەبوو قورئانەک ب زمانێ کوردی بیت یان انگلیزی بیت یان چینی بیت بۆ قەومەکێ عەرەبی بهێت خارێ ........

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ژبەر هندێ دێ ناچارین ئەم پرسیارێ ب ڤی نەوعی بکەین " بۆچی پێغمبەر ل ناڤ قەومێ کورد هەلنەبژاردیە ل ناڤ عەرەبا یێ هاتیە هەلبژاردن !؟

بەری ئەم بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەین بلا وسا دابنێین ئەم هەردووک موسلمانێن و خەلکێ صینین ، هنگی دا چ بێژین ؟

ئەرێ بۆچی پێغمبەر صل الله علیه وسلم ل ناڤ قەوێ صین هەلنەبژێردرا دناڤ عەرەبا هەلبژارد !؟

وئەگەر ئەم موسلمانەکێ ئەلمانی باینە دا چ بێژین ؟

" ئەرێ بۆچی پێغمبەر ل ناڤ قەومێ المانیا نەهاتیە هەلبژاردن دناڤ عەرەبا هاتیە هەلبژاردن !؟

وەکی ئەم دزانین ئەڤە دوماهیک ناهێت ، ژبەرکو دبیت بۆ هەمی قەومێ سەر عەردی نەفسی پرسیار بکەین ....

چونکی نابیت پێغمبەر کوو دوماهیک پێغمبەرە ڵ ناڤ هەمی قەوما د ئێک دەمدا بهێتە هەلبژاردن و قورئان ژی ب هەمی زمانا بهتە خار حەتا ئەگەر ب کوردی ژی با ئەگەر سۆرانی با بادینی دا بێژن بۆچی ب بادینی نیە ئەگەر بادینی با سۆرانی دا بێژن بۆچی ب سۆرانی نیە ، ئەگەر هەورامی با فلان دا بێژن بۆچی هەورامیە حەتا ل بادینان ئەگەر ب زێباری با سورچی دا بێژن بۆچی ب سورچی نیە ،ئەگەر ب سورجی با زێباری دا بێژن بۆچی ب زێباری نیە .... یەعنی ئەڤە دوماهیک نەدهات ب چ شکلەکی ئەڤ سیراعە .

ژ بەر هندێ خودایێ مەزن دناڤ هەمی کیشوەراندا کیشورەک هەلبژارد دناڤ هەمی ولاتان ولاتەک و دناڤ هەمی نەتەوا نەتەوەک هەلبژارد ل ناڤ هەمی زمانا زمانەک هەلبژارد ل ناڤ هەمی باژێرا باژێرەک هەلبژارد و

پێغمبەر و قورئانا خۆ بۆ ناڤ وی قەومی و نەتەوی فرێدکەت پشتی هنگی ئەو لناڤ نەتەوێ دیکە ل سەر عەردی بلاڤ دکەنەڤە .

ئەڤە هەلبژاردنا بەدیهەنێەرێ مەزنە ئارەزوویا چ کەسی تێدا نیە

خالەکادی تەورات و ئنجیل ب زمانی عیبرانی وئارانی بووینە چونکی قەومێ وان ب وان زمانا یێ ئاخفتی و پێغمبەرێ وان دناڤ وان ب وان زمانا یێ ئاخفتی قورئان ژی ب عەرەبیە چنکی دناڤ عەرەباندا یا هاتی .

و بارودۆخێ وی ناوچەی پێدڤی بوو ب هاتنا پێغمبەرەکی و باشترین جهـ وێرێ بیە حەتا چ شک نەمینن ژ راستیا وی پێغمـەری چنکی مەککە شارستانیەتا وێ یا سفر بوو و چ پێشکەفتن و قوتابخانە ل وێرێ نەبین و کەفتبوو د ناڤبەرا رۆم و فارسا کوو هەردووک خودانێ شارستانیەکا مەزن بین ، ئەگەر دناڤ فارسا هاتبا رۆم دا بێژن فارس خودانێ شارستانیەکا مەزنن ژبەر هندێ وانا نڤیسەرێ مەزن یێ هەین و وانا بخۆ یا دروست کری و ئەگەر دناڤ رۆمانیا دا هاتبا فارس ژی نەفسی ڤی تشتی دا بێژن ، بەلێ ئەگەر دناڤ عەرەبا با ئەڤ ئەگەرا وان نەدما ژبەر ڤێ خالێ و چەندین خالێن دیکە بونە ئەگەر ژ ناڤ عەرەبا بهێت هەلبژاردن .

---

بەشەکی ڤی پۆستی مفا یێ هاتیە وەرگرتن ژ کتێبا تامەزرۆی تێگەهشتنا قورئانێ مە .

## پرانیا خەلکێ دوزەخێ ژنن ؟

کانێ مافێ ئافرەتێ ؟

سلام علیکم عەزیزان هاتینە لسەر بابەتەکێ دی کو دژە ئیسلام دبینن کێماسیا دادیێ د اسلاما پیروز دا

ئەوژی فەرمودا پێغەمبەری( ) :-

(اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ) . رواه البخاري ٣٢٤١ ومسلم ٢٧٣٧ .

عەزیزان دژە ئیسلامیا دڤێن نیشا ژن و کچ و خیشك و دایکێت مە بدەن کو رێز لژنێ نەهاتیە گرتن وپڕانیا اهلێ دوزەخێ ژنن

بەلێ زوربەیا اهلێ بەهەشتێ ژی ژنن !!

ان شاء الله دی دیارکەین دگەلمن بە

عەزیزان بەڵگە چیە کو زوربەیا خەلکێ بەهەشتێ ژنن ؟

شیخ الاسلام ابن تیمیة دبێژیت :-

( لِأَنَّ النِّسَاءَ أَكْثَرُ مِنْ الرِّجَالِ إذْ قَدْ صَحَّ أَنَّهُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ وَقَدْ صَحَّ لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ زَوْجَتَانِ مِنْ الْإِنْسِيَّاتِ سِوَى الْحُورِ الْعِينِ وَذَلِكَ لِأَنَّ مَنْ فِي الْجَنَّةِ مِنْ النِّسَاءِ أَكْثَرُ مِنْ الرِّجَالِ وَكَذَلِكَ فِي النَّارِ فَيَكُونُ الْخَلْقُ مِنْهُمْ أَكْثَرَ ) مجموع الفتوى ٤٣٢/٦

(چونکی ژن ژ زەلاما پترن لەوما پتریا خەلکێ دوزەخێ ژنن، و فەرمودا هەی کو هەر زەلامەکی د بەهەشتێ دا دوو ژن بێت هەین ژ مروڤا نە حوریا لەوما د بەهەشتێ دا ژن ژ زەلامی پترن و د دوزەخێ ژی دا پترن چنکی ژن ژ زەلاما پترن )

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

فەرمودا پێغەمبەری( سلاف لیبن ) دبێژیت :-

(( إن أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر، والتي تليها على أضوأ كوكب دري في السماء، لكل امرئٍ منهم زوجتان اثنتان...))

((ئێکەمین دەستەك دچنە بەهەشتێ لسەر شکلێ هەیڤا چاردە شەڤینە،ویا دیفرا لسەر شێوی روناهترین هەسارەنە ،بو هەر ئێك ژوان دوو هەڤژین بێت هەین ))

عەزیزان دیقەتا پەیڤا دوو هەڤژین بکە ئانکو هەر زەلامەکێ لبەهەشتێ دوو ژن بێت هەین ئانکو رێژا وان ژنان زەلاما پترە هەتا دبەهەشتێ ژیدا

د فەرمودێ دا گووت :-

(...وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ)

(من سەحکرە دوزەخێ ،پتریا خەلکێ وێ ژن بوون)

١:هیچ ئاریشە نینە ژن پتریا بەهەشتیا و دوزەخ نشینا بن

٢:ژبەرکوو ژن د دونیایێ دا پترن ژ زەلاما

٣:و هەروەسا دناڤ دوزەخ نشینێن ژن دا ژنێت موسلمان ژی هە نە ئانکو پشتی ژ گونەهادهێنە شیشتن هەر دزڤرنە بو بەهەشتێ

و بەری کو بەحسا پرانیا خەلکێ بەهەشتێ بکەت یا گوتی :-

(اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ)

(من بەرێ خودا بەهەشتێ زوربەیا خەلکێ وێ هەژارن )

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

لڤێره دا رەگەز دەستنیشان نەكریه بتنێ حالەتێ دیاركری

ئانكو ژنێت هەژار ژی یێت هەین

فەرمودەكا دی دبێژیت :-

(إِنَّ أَقَلَّ سَاكِنِي الْجَنَّةِ النِّسَاءُ)

(كێمینەیا خەلكێ به هەشتێ ژنن )

عەزیزان هەگەر بەراوردی بكەین ژن دگەل حوری و غیلمان و زەلاما

ژن كیمینەیه !!

هەگەر بەراوردی دگەل ژن و زەلاما بتنێ بكەین د بەهەشتێ دا

ژن زورینەیه !!

بەلێ هەگەر كێمینه ژی بیت پشتی ئەو ژنێت تاوانبار ژ دوزەخێ دەردكەڤن دێ داخلی به هەشتێ بن ودێ بنه زورینه

ب كورتی :-

ژن زورینەیا بەهەشت و دوزەخێ یه چونكی هژمارا وان ژ زەلاما پتره

## بۆچی چ ئافرەت پێغمبەر نەبووینە ؟

دەست پێکێ دڤێت بزانین کوو ل قورئانێ دوو شێوە ناڤێ پێغمبەرا یێ هاتی ئێک رسول یا دی نبی

رسول ئەون یێ کتاب بۆ هاتی و نبی ئەون یێ درێژە پێدەرێ کتابێت بەری خۆ یەعنی دبیت ( نبی ) بی بەلێ کتاب بۆ نەهاتبیت و ژمارا پێغمبەرا ۱۲٤۰۰۰ پێغمبەر بووینە و تنێ ناڤێ ۲۵ پێغمبەرا یێ هاتی د قورئانی یێ دی کەس نزانیت کینە!

خودایێ مەزن دبێژیت

وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ( ۷ )

ئێمە پێش تۆ کەسانی ترمان ڕەوانە نەکردووە، جگە لە پیاوانێک (کە هەڵمانبژاردوون)، وەحی و نیگایان بۆ ڕەوانە دەکەین، دەبپرسن لە خاوەنی کتێبەکانی پێشوو ئەگەر ئێوە ئەم ڕاستیانە نازانن.

ل سەر ڤێ مەسەلێ دوو رەئی هەنە هندەک دبێژن کوو ئافرەت ( نبی ) بووینە بەلێ الرسول نەبووینە وەکی دایکا موسای علیە سلام یانژی دایکا عیسای مریم رازی بوونا خودێی لسەر هەردووکا بیت .

بەلێ رەئیا دووێ دبێژیت نەخێر ئافرەت نە ( النبي ) ( الرسول ) بووینە ژبەر ڤان هۆکارا

ئێکەم چونکی ئافرەت سورێ هەیڤانە یێ هەی ( حیظ ) ئانکۆ کەڤتنە سەر خوین رووددەت و ئەڤەژی وەدکەت ئافرەت بۆ ماوێ چەندین رۆژا بێ نڤێژ ببیت و چ فەرز لسەر نینە ، باشە ئافرەت وی دەمی دا چەوا دینی گەهینیت وان رۆژا یێ د ڤی قۆناغێدا ؟؟ بێ گومان چێ نەدبوو .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

خالەکادی ئەوە کوو زەلام ئەرکێ وی یێ قورسە و هەردەم د شەری دا بوویە و جیهاد کریە بۆ گەهاندنا دینێ خودێی بەلێ ئافرەتێ زەحمەت بوو ئەڤە پێ بێتە کرن .

خالەکادی ئەگەر ئەو ئافرەت یا جان با کوو ببیتە پێغمبەر دبوو هاتبا پەرستن ژ لایێ هندەک جاهلا ژبەر جانیا وێ ، و چونا دەرێ بۆ ئافرەتێ بێ مەحرەم بۆ دەڤ زەلاما جایز نیە پا چەوا دا بانگەوازیێ کەت بۆ سەرکردا کوو هەمی دەما زەلام سەرکردە بووینە رێژەکا کێم نەبیت بتایبەتی بەرێ کوو چ جارا ئافرەت سەرۆک ولات نەبووە ژ ڤێرەژی مشکیلە دا بۆ چێبیت .

خالەکادی سروشتێ ئافرەتێ هەردەم یێ ناسک و رح سڤکە و خۆ لبەر ئاریشا و زەحمەتیا ناگریت و یا دیارە هەمی پێغمبەر توشی نارحەتیێ مەزن بووینەڤە و هەمی یێ هاتینە دەرکرن ژ باژێرێ خۆ ، بەلگەژی شنی پێغمبەری وەحی بۆ هاتی و چوو دەڤ وەرەقەی کورێ نەوفەل و سوعبەت بۆ گۆت وەرەقەی گۆتێ خوزی ئەز مابام ساخ و من هاری تە کربا دەمێ تە ژ باژێرێ دکەنە دەرڤە ! پێغمبەری گۆت بۆ ما قەومێ من دێ من کەتە دەرێ ژ باژێری !؟ وەرەقەی کوری نەوفەل گۆتێ بەلێ هندی پێغمبەر هەبووینە یێ هاتینە دەرکرن ژ باژێرێ خۆ

ل ڤێرە د پرسین چەوا ئافرەتا هندە باش و رح سڤک دێ تەحەمولا دەرکرنێ کەت و یا ڤان هەمی نەخۆشیان ؟؟!

خودایێ مەزن رێز یا ل ئافرەتێ نای حەتا وی رادەی پێغمبەر دبێژیت هەر کەسەکێ دوو کچا ب جانی بخودان بکەت خودێ دێ وی بەتە بهەشتێ .

## ( تاوانا ئەوێن د جنە دوزەخێ سکس و مەشروبە و پاداشتا(حەقێ) بەهەشتیان ژی سکس و مەشروبە) ؟

دێ ببین کەسەکێ ملحد و بێ دین یان موسلمانەکێ نەزان یان موسلمانەکێ زانا بوو دژایەتیکرنا دینی یان موسلمانەکێ ئیمان لاواز دێ فێ گووتنێ کوپی کەت و دێ بێژیت توو تێدگەهی و ئەس تێناگەهم !!!!!

بەرسڤ :- بەلێ ئەس موسلمانم و تێدگەهم و چ پسیار د ئاینێ من دا نینە بەرسف نەبیت هەمی یا رون و ئاشکەرایە وەکی روناهیا روژێ .....

ل دەستپێکێ دهاتە گووتن (تاوانا ئەوێن دجنەدوزەخێ سکس و مشروبە ) یان ب ڤی شێوەی ( ئەوێ سکس دکەت و مشروبی فەخوت حەقێ وی دوزەخە ) ، جونکە خودایێ مەزن ڕێگرە ل هەر تشتەکی ب بیتە ئەگەرێ زیان گەهاندن بو کومەڵگەهێ ، هەر کومەڵکەهەکا زنا و فاحیشە دناڤ دا بەلاڤ بوو د بیتە ئەگەرێ زیادبوونا زاروکان بێ دەیک و باب و ئەو زاروکە کەس و کارێن خوو نانیاسیت ، وەکی گیانەوەران دێ ژیانا خوە بەتە سەری ، ژبلی وێ یەکێ دێ بیتە ئەگەرێ جەندەها نەخوشیان وەکی ئایدز ...هتد مروف و مروفایەتی د هیلاک د جیت ،و فەخوارنا مشروبی خودایێ مەزن قەدەغەکریە ، جونکە دیسان زینەکا زور و زەرەر هەیە بو کومەڵکەهێ خودێ نەڤێت توو عەقلێ خوو ژ دەست بدەی و ب سەر خوشێ ژیانا خوە ب بەیە سەری و توشی جەندەها جەریمان بی ب رێیا مادێن بێ هوشکەر .......

پارچا دووێ ( پاداشتا ئەوێن دجنە بەهەشتیا ژی سێکس و مشروبە ) یان ب شێوەکێ دی ( ئەوێن د جنە بهەشتێ ژی حەقێ وان سێکس و مشروبە ) دێ ل ڤێرێ پسیار د هێتە کرن جەوان و دی خوو کوێرکەت و خوو نەزان کەن بێژن ئەڤە جەوا چێ دبیت دا بهێینە سەر بەرسفێ ...

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بەرسف :- ئەو ئافرەتا خودێ بەهەشتێ د دەتێ ، هەر وەکی هاوسەرگێریا دنیایێ یە و خودایێ مەزن ب حەلالی و ب پاکی دێ دەتە تە و دێ بیتە ملک و مالێ تە ل بەرامبەر وێ خوو ڕاگریێ و چاکیی و بەندایەتیا ل دوونیایێ ل بەرامبەر خودایێ مەزن ئەنجام داین، ئەو مەشروب و خوارنێن بەهەشتێ وەکی یێن دنیایێ نینن ، تە سەر خوش بکەت و ئاگەهـ ژ خوو نە بیت یان بچی زەرەرێ بکەهینیە دەوروبەران یان توشبیتە جەندەها نەخوەشیان ...

نەخێر پێچەوانە خودێ تشتێ زیان بەخش و خراپ و پیس نادەتە کەسێ ل بەهەشتێ ، و هەروەسا سێکس و مشروب وەکی لەزەت و خوەشیێ تە ماشەدکەت ل دنیایێ ژ وێ لەزەت و خوشیێ جەندین نەخوشی و زیان د دویفرا دهێن بەلێ ل بەهەشتێ ب پێجەوانە یە هیچ خرابیەک و نەخوەشیەک ل دیفدا نینە بلکو د بیت ئەگەرێ خوشی و ئارامیا هەتا هەتا یێ ............

## **عـــەزابـا قـــەبـــری نـــیـــنـــه !!**

هەر چەندە گەلەک فەرموودێن پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هەنە ل سەر عەزابا قەبری بەلێ ل ڤێرێ بتنێ دێ بەحسێ ئایەتێن قورئانێ کەین چونکە یا دیار گەلەکێن هەین ڤی سەر دەمی باوەری ب پتریا فەرموودا نینە .دابهێین سەر بابەتی بەلێ گەلەک بەلگە هەنە ل سەر عەزابا قەبری و ئەوێن دبێژن عەزابا قەبری نینە بلا باش سەحکەتە ڤێ پارچە نڤیسینێ،

ل دەستپێکێ دا بهێینە ئایەتێن قۆرئانێ.

دسورەتا الغافر دا ل ئایەتا ٤٦ێ خودێ دبێژیت:النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ (٤٦)

اها ل ڤێرێ ئایەت عەزابا ڕوژا دماهیێ ب سەخت تر و دژوار تر ددانیت کۆ عەزابا بەری ڕوژا دماهیێ عەزابا قەبری یە،

چەوا قورئانێ باسێ عەزابا قەبری نەکریە؟!!، بەلێ بوو نمونە دسورەتا ئەنفال دا د چەند ئایەتەکا دبێژیت: وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا ۙ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ (٥٠) ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ (٥١) كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ ۙ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٥٢)

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دڤان ئایەتان ژی دا خۆدایێ مەزن گەلەک ب ڕون و ئاشکەرا باسێ عەزابا قەبری دکەت پشتی مرنێ بەرێخۆبدەنێ !

(إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا) ۙ

واتە:ئەگەر تو وان ببینی ئەوێن بێ باوەر بووین چ دهێتە سەرێ وان پشتی مرنێ ،(الملائكة يضربون وجوههم وادبارهم وذوقوا عذاب الحريق)! ، واتە مەلائیکەت ل سەرو چاڤێن وان و پشتا وان ددەن و وان توشی عزابا سوتنێ دکەن،چونکە وان یا ب سەرێ خۆە ئینای

باشە تە چ جارا کەسەک دیتیە دەمێ دسەکەراتێن مرنێدا یان تە گوهلێ بوویە مەلائیکەت دەینن وی کەسی وەک ئەڤ ئایەتا مەبەری نوکە باس کری !!؟ بێگۆمان نەخێر ،دێ پا دیارە ئە ئایەتا مە گۆتی باسێ ڕوژا دماهیێ دکەت؟ نەخێر،

ئەوا روونە ل ڤێ ئایەتێ عەزابەکا دی ژی یا هەی پشتی مرنێ مباشر کوو دبێژنێ عەزابا قەبری یان یا بەرزەخێ

ئەوێن دبێژن عەزابا قەبری نینە پتریا وان ڤان ئایەتا دئینن وەک بەڵگە !

١-ولا تحسبن اللـه غافلا عما يعمل الظالمون إنما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الأبصار !،

باشە ئەڤێ ئایەتێ عەزابا قەبری ڕەدکریە یان ژی پشتگیریا عەزابا قەبری کریە؟! بێگۆمان پشتگیریا هەبوونا عەزابا قەبری دکەت و قەت نابیتە بەڵگە ل سەر نەبوونا عەزابا قەبری چونکە چێدبیت ئەو ڕوژە د دونیایێ دابیت ڤێجا چ ژیانا بە رزەخێ بیت کۆ عەزابا قەبریە یان ژی ڕوژا دماهیێ بیت،

بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ

بێگومان ئەگەر ئایەت باسێ ڕوژا دماهیێ ژی بکەت هیچ کێشە نینە و نزانم چاوا وان بوو خۆە کریە بەڵگە ل سەر نەبوونا عەزابا قەبری !!؟

٢- جماعەتا عەزابا قەبری ڕەد دکەت ئایەتەکا دی دئینن وەک بەڵگە ! ئەو ژی

(وجاءت سكرة الموت بالحق ذلك ما كنت منه تحيد)!!؟ نزا ڤێ ئایەتێ ژی چ پەیوەندی ب عەزابا قەبری ڤە هەیە!!؟ ئاخر ئەڤ ئایەتە باسێ مرنێ دکەت و دبێژیت مرن یا حەقە و دێ هێت،

٣- ئایەتەکا دی دئینن ئەو ژی

(ونفخ في الصور ذلك يوم الوعيد)

ئەڤ ئایەتە باسێ پفکرنا بوقێ دکەت و هاتنا ڕوژا دیماهیێ،کو ڕوژا حەق و حسابێیە، دیسا دبێژم ڤێ ئایەتێ ژی چ پەیوەندی ب ژیانا بەرزەخێ و عەزابا قەبری ڤە هەیە !!؟؟

٤- ڤێ ئایەتێ ژی دئینن،قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ ۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ (٥٢)سورەت یاسین،ئایەت دبێژیت دەمێ ڕوژا قیامەتێ ڕادبیت ئەو خەلکێ ژ قەبرا ڕادبیت دبێژن ، وەیل و نەخۆەشی بوومە بیت خۆەلی بمە وەربوو ئەڤە کێ ئەم ژ قەبرێن مە ڕاکرینە ؟؟، ئەوێن عەزابا قەبری ڕەددکەن دبێژن ئەگەرعەزابا قەبری هەبا ڤان کەسا نەدگۆت کێ ئەم ژقەبرێت مە ڕاکرینە ،ئەم ژی دبێژین باشە عەزابا قەبری دژوار ترە یان عەزابا ڕوژا قیامەتێ ئانکو یا جەهنەمێ؟؟ بێگۆمان عەزابا جەهنەمێ گەلەک

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دژوار ترە لەوا ئەو نەحەق نینن وێ ڕوژێ وەبێژن چونکە دزانن دێ چنە بەر عەزابەکا دژوار تر ژ عەزابا قەبری ئەو ژی عەزابا جەهنەمێ یە ،

ئایەتەکا دی ،

كل نفس ذائقة الموت وإنما توفون أجوركم يوم القيامة فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور،

بێگۆمان حساب ڕوژا دماهیێ یە بەلێ ژیانا بەرزەخێ ژی ل پێشیا ڕوژا دماهیێ هەیە و ئەڤە ژی نابیتە بەڵگە ل سەر نەبوونا عەزابا قەبری،

گەلەک ئایەتێن دی ژی دئینن کۆ باسێ سزای و پاداشتێ ڕوژا دماهیێ دکەن بەلێ چ ژ وان ئایەتا نەبوونا عەزابا قەبری ناسەلمینن چونکە هەر وەکی مە گۆتی ڕوژا دماهیێ و عەزابا قەبری چ پەیوەندی پێکڤە نینە و دوو تشتێن ژێک جودانە،

و پشتی هنگێ ژی هندەک پسیارێن بێ سەروبەر دکەن ژ پرسیارێن وان دیار دبیت کۆ وان شارەزایی یەکا تمام نینە ل سەر عەزابا قەبری و چەوانیا وێ،

و ل دماهیێ ژی باسێ ال فیرعەون دکەن و دانپێدانێ ب عەزابەکا دی ژبلی عەزابا ڕوژا دماهیێ دکەن و دسەلمینن کو عەزابا قەبری یاهەی بەلێ وێ ئایەتێ تایبەت دکەت ب

ال فرعەون ڤە،ئەڤە ددەمەکێ دایە کۆ ئەو بخۆە دبێژن حەق و حساب بتنێ ل ڕوژا دیماهیێ یە !! باشە پا ال فیرعەون بووچی بتنێ بهێتە عەزاب دان؟؟ باشە بونمونە ل ڤی سەردەمی هندەک هەنە گەلەک ژ فیرعەونی خابترن !! باشە پا دێ چ تشت بو ڤان جورە مروڤا هەبیت؟؟!!

بەلێ هەر وەکی مە گۆتی ئەوێن عزابا قەبری ڕەددکەن هەڤژن دئاخفتنێن خۆە دا و مە هەڤدژیا وان دیارکر.

دا بهێین بەڵگەیێن بهێزتر ل سەر هەبوونا عەزابا قەبری بێژین

خودایێ مەزن دبێژیت ،( ولو ترى إذ الظالمون في غمرات الموت والملائكة باسطوا أيديهم أخرجوا أنفسكم اليوم تجزون عذاب الهون بما كنتم تقولون على الله غير الحق وكنتم عن ءاياته تستكبرون ) . سورة الأنعام : ٩٣

واتە،ئەگەر ل وی دەمێ ستەمکار دکەڤنە بەر سەکەراتێ و نەخۆشی وعەزابێ تو وان ببینی چەوا دهێنە ئازاردان و مەلائیکەتێ ڕوح کێشانێ ژی دەستێن ۆان ژێکڤەدکەن و ل وان ددەن (ئەڤە هەتا ڤێرێ بەحسێ بەری مرنێ دکەت ئانکو ددەمێ سەکەراتێ دا)شنی دبێژیت (أخرجوا أنفسكم)دبێژنە وان ڕوحێ ژ جەستەیێ خۆە بدەرێخن)(ئەڤە ژی ل دەمێ ڕوح دەرکەتنێ ژ جەستەی)و شنی پشتی ڕوح دەرچوونێ ئێکسەر ئایەت دبێژیت(اليوم تجزون عذاب الهون )واتە ئەڤروکە ژی عەزابەکا دژوار بخون و تام بکەن ب سەرشوڕی ڤە، ئەگەر هویر بەرێخۆبدەیە ئایەتێ ئێکسەر پشتی (أخرجوا أنفسكم)دبێژی(اليوم تجزون عذاب الهون ) بێگۆمان باسێ عەزابا قەبری دکەت چونکە پشتی مروڤ دمریت مروڤی دکەنە دقەبری دا،

ئەگەر ئێک بێژیت مەبەستا ڤێ ئایەتێ عەزابا جەهنەمێ یە ! ئەم ژی دبێژینێ هەر پشتی وی ئایەتێ قورئان باسێ ڕوژا قیامەتێ ژی دکەت

وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ

عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ (٩٤) سورەت الانعام،ژبەر هندێ ئەو ئایەتا بەری ڤێ چ ئیحتیمالا ناهەلگریت ژبلی عەزابا قـــــەبـــری،

بەلێ ئەڤەیە بەڵگەیێ مە ل سەر عەزابا قەبری و بهێزترین بەڵگەیە

النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ

بێژن من ( غُدُوًّا وَعَشِيًّا )واتە چ؟؟ئەگەر نە بەحسێ عەزابا قەبری بیت؟

ئەگەر بێژن مەبەستا ئایەتێ باسێ ڕوژا قیامەتێ یە دبێژم نەخێر چونکە ئایەت دیڤدا دبێژیت،

وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَاب ،واتە عەزابەکا دژوار تر بدەنە بەر وان ل وێ ڕوژا قیامەت ڕادبیت ل ڤێرێ لەوا ئایەتێ گۆت عەزابەکا دژوار تر چونکە بەری هنگێ عەزابەکا دی ژی هەبوو ئەو ژی عەزابا قەبری یە و الله اعلم،

## فەرمووده ( حەدیس ) بەشەکە ژ شەریعەتێ ١

دەست پێکێ بلا بێژین قورئانی کینه ب کورتی ئەون یێ دبێژن کوو تنێ قورئان مه پێدڤی چ حەدیس و تەفسیر و ففهـ ی نینه و ل ٨٠% دینی رەتدکەن و زۆربەیا ئایەتا ژی لدیڤ هەواو ئارەزوویێ خۆ تەفسیر دکەن کوو لدەف وانا وسایه عەقل هەمی تشته و دشێین ب عەقلێ خۆ بگەهین هەمی راستیا ، ئەژی دێ بێژم بلا ب عەقل بیت بەلێ کیش عەقل ؟؟ ئەرێ عەقلێ هەمی کەسا یێ تمامه ؟ ئەرێ کەسەک هەیه عەقلێ وی یێ تمام بی ١٠٠% و هەمی تشتا بزانیت ؟؟ دا بیچن سەر بابەتیێ خۆ

چونکی قورئانی ئەون یێ فەرموودا رەتدکەن و ناوەرگرن و باوری پێ نینه ئەمژی دێ چین بەلگا بۆ تنێ ژ قورئانێ ئینین کا چ دبێژیت لسەر ڤی بابەتی

رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ( ١٢٩ )

خودایێ مه توو دناڤ ڤێ ئومەتێ پێغمبەرەکی ژ دوندەها ( ئیسماعیلی ) ئایەتێن ته بۆوانا بخوینیت و قورئانێ و سونەتێ نیشا وانا بدەت ، وان ژ شرکێ و ئەخلاقێ خراب پاقژ بکەت هندی تویی تویی زالی چ تشت ژبەر ئاسێ نەبن ، کاربنەجهێ هەر تشتەکی ل جهێ وی ددانت .

هین هەمی سەحکەنێ ئەم دزانین کتابا خودێی قورئانه بەلێ پا الحکمه چیه ؟؟ و خودای بەحسێ چیه حیکمەتا پێغمبەری چیه باشه ئەگەر حەدیس نەبیت کوو ناڤەرۆکا قورئانێ بەحس دکەت ئەڤ ئایەته بەسه بۆ هندێ کوو حەدیس ژی بەشەکە ژ شەریعەتا ئیسلامێ .

و هەروسا ئەڤ ئایەتەژی

كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ( ١٥١ )

وکانێ چەوا مە قەنجی ل هەوە کرد کوو مە بەرێ هەوە دا کەعبێ وەسا مە پێغمبەرەک ژ هەوە بخۆ ژناڤ هەوە دا هنارت ئەو وان ئایەتێن حەقیێ و نەحەقیێ ژێک جودا دکەن ئەو بۆ هەوە دخوینیت و هەوە ژ پیساتیێ و بوت پەرستیێ و رەوشتێن خراب پاقژ دکەت ، کیتاب و سونەتێ و ئەحکامێ شەریعەتێ نیشا هەوە ددەت ، ویا هەوە نەدزانی ژ بەحسێ پێغمبەری و ملەتێن بوری نیشا هەوە ددەت .

هەر دوبارە دێ وێ پرسیارا سەری کەینەڤە ئەم دزانین الکتاب بەحسێ قورئانێیە بەس الحکمە بەحسێ چیە ؟ هین بخۆ بریار بدەن .

خودایێ مەزن د چەندین جها دبێژیت : قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ( ٣٢ )

ئەی پێغمبەر توژی بێژە هین ب دویڤکەتنا کیتابا خودێی و بدیوڤکەفتنا سونەتا پێغمبەری ، ئەگەر وانا پشتا خۆ داتە هەر مانە لسەر کوفرا خۆ ، ئەو د هێژای ڤیانا خودێ نابن ، چونکی هندی خودێیە حەش کافرا ناکەت .

پرسیار ئەوە ئەرێ اطیعوا الله ئەم دزانین بەحسێ قورئانێیە بەلێ اطیعوا الرسول بەحسێ چیە ؟؟ غێر معقول ژی یە بێژی هەردووک بەحسێ قورئانێیە چونکی الرسول یەعنی پێغمبەر و ئاخفتنا وی و قورئان نە ئاخفتنا

ویه بەلکو حەدیس ئاخفتنا ویه ، و چەندین جهێ دیژی هوسا یا دوباره بوویەڤه وەکی ال عمران ٥٣ ( رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ

التوبه ٢٩ ( قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ )

ل ڤێره تنێ دێ بێژم ئەرێ ئەم هەمی دزانین ئەو تشتێ خودێی حەرام کرین یێ د قورئانێ هاتین بەلێ ئەو چ تشتن یێ پێغمبەری حەرام کری ؟ و ژ کیڤەنه ، ناچێبیت توو بێژی هەر یێ دقورئانێ چونکێ قورئان ئاخفتنا خودێیه نەک پێغمبەری و چ پێدڤی نەدکرد دوو جارا بەحسێ قورئانێ بکەت بێژیت ئەوێ د قورئانێ هاتین حەرامن و دوو جارا بێژیت !

ال عمران ١٣٢( وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)

ال عمران ١٦٤ ( لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)

ال عمران ١٧٢ ( الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ )

الاحزاب ٣٦ ( وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا )

النساء ١٣ ( تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ )

النساء ١٤ (وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ )

النساء ٤٢ ( يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا )

النساء ٥٩ ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا )

النساء ٦٩ ( وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا )

النساء ٨٠ ( مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ) !!! ل ڤێ ئایەتێ تەكید دكەت هەر كەسێ گوێرایەلیا پێغمبەری بكەت وەكی وێ چەندێیە گوێرایەلیا خودێی كری ! ئەم هەمی دزانین قورئانێ جێبەجێ بكەین گوێرایەلیا خودێیە بەلێ پا یا پێغمبەری چیە ؟؟ ئەگەر حەدیس نەبیت .

المائده ٥٦ ( وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ )

المائده ٩٢ ( وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ )

الاعراف ١٥٨ ( الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ )

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

الانفال ١ ( يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ )

الانفال ١٣ ( ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ )

و سەدان جهێ دیژی یاهاتی هەر لسەر ڤی بابەتی پێدڤی ناکەت بنڤیسم بۆ نموونە ل ئەنفال هەر ل ئایەتا ٢٠ ٢٤ ٢٧ ٤١ ٤٦

ئەڤە وچەندین ئایەتێن دی کوو نزیکی ٢٠٠ ئایەتانە لسەر ڤی بابەتی دا بابەت درێژ نەبیت هەمیێ نانڤیسم

ل ڤێرە دێ بێژم بەرێزێ من ب چ پیڤەر توو دبێژی حەدیس بەشەک نیە ژ دینی ؟ تە چ خاندیە یان چ ئاستەکی یان زانایێت بەری نوکە کێ گۆتیە فەرمووده بەشەک نیە ژ دینی و دێ بێژمەتە پیڤەرێ تە چیە بۆ رەتکرنا حەدیسا ئەگەر تنێ هەواو ئارەزوو بیت فەرقاتە و بێدینەکی نیە چونکی ئەوژی دینی ل دیڤ هەواو ئارەزوویێ خۆ لێک ددەت ئەگەر بێژی نە فەرموو پیڤەرێ رەتکرنێ بۆمە بێژە.

## ئەرێ فەرمووده ( حەدیس ) بەشەکە ژ شەریعەتی ؟ ٢

ل بەشێ ئێکێ مه چەندین نموونه ئینانەڤە لسەر فەرزیەتا گوێرایەلی کرن پێغمبەری ل ڤی بەشی دێ ئێک دوو نموونا ئینین کوو فەرزیەتا حەدیسێ دسەلمینیت .

خودایێ مەزن ل سورەتا البقره ئایەتا ١٤٤ دبێژیت

قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ (١٤٤) ب ڕاستی ئەم یێ وەرگێرانا ڕوویێ تە -ئەی پێغەمبەر- جارەکێ ل دویڤ جارەکێ ب بال عەسمانی ڤە دبینین؛ ل وێ هیڤییێ کو خودێ وەحییێ بۆ تە د مەسەلا ڕووگەهێ دا بینتە خوارێ، ڤێجا ئەم دێ بەرێ تە ژ بەیتولمەقدسێ وەرگێڕینە ڕووگەهەکا تە پێ خۆش بت، کو مزگەفتا حەرامە ل مەکەهێ، ڤێجا تو بەرێ خۆ ب لایێ وێ ڤە بدە، وهەر جهەکێ هوین -گەلی موسلمانان- لێ بن، وهەوە ڤیا نڤێژێ بکەن، هوین بەرێ خۆ بدەنە مزگەفتا حەرام. وهندی ئەون یێن خودێ زانینا کیتابێ دایێ ژ جوهی وفەلان، ئەو باش دزانن هندی بەرێخۆدانا تەیە بۆ کەعبێ ئەوە حەقییا بنەجهـ د کیتابێن وان دا. وخودێ یێ بێ ئاگەهـ نینە ژ کارێ ئەو دودل وگومانبەرێن هە دکەن، وئەو جزایێ وان سەرا وێ چەندێ دێ دەتێ.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ل ڤێره دیار دبیت کوو خودایێ مەزن فەرمان ب پێغمبەری کری کوو بەرێ خۆ بدەت مسجد الحرام ، کوو بەری هنگی بەرێ ویل مسجد الاقسى بیت یان جهەک دی بیت بەلێ نه ل مسجد الحرام بیت ، ئەم دێ پرسین ئەرێ روگەهێ قیـبلێ بەشەک نیه ژ دینی ؟؟ ئەرێ دێ چێبیت ئەز بەرێ خۆ نوکه بکەم مزگەفتەک دی ژ بلی مسجد الحرام ؟؟ ئەکید نەخێر مادەم دروست نەبیت یەعنی بەشەک ژ دینی .

باشه بەری خودێ ڤێ ئایەتێ بینیت خار و بێژیتێ بەرێ خۆ بدەن مسجد الحرام ئەرێ ما موسلمانا نڤێژ نەدکرن ؟ بەلێ دکرن ئەرێ بەرێ خۆ نەددا قیبلەکادی بەری خودێ بێژیتێ بەرێ خۆ بدەن مسجد الحرام ؟ بەلێ زۆربەیا مفسرا د بێژن مسجد الاقسى بیه دا بێژین ئەرێ چ ئایەت هەنه کوو گۆتبیت بەری هنگی بەرێ خۆ بدەن مسجد الاقسى یان مزگەفەتەکادی ؟؟ نەخێر نینه هەره هەمی قورئانێ سەحکێ .

باشه ئەگەر حەدیس و کریارێت پێغمبەری وەحی نەبیت ئەو چەوا لدەڤ خۆ جهەک کریه قیبله ؟ بۆ نڤێژێ ؟؟ مانه قیبله بەشەکه ژ دینی پا پێغمبەری بۆچی بەرێ خۆ کریه وێرێ بێ کوو چ ئایەت لسەر هاتبن خارێ ، ل ڤێره چەند احتیمالەک د ئێنه پێش .

١_ یان وەحی یێ بۆ هاتی د ناڤ قورئانێ و بێژیتێ بەرێ خۆ بده مسجد الاقسى .

٢_ یان ب رەئی و اجتهادا خۆ بیه .

٣ _ یانژی وەحی یێ بۆ هاتی ژ دەرڤەی قورئانێ .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەکید یا ئێکی نیە چونکی هەمی قورئانێ بگەری توو نابینی ئایەتەک هاتبیت گۆتبیتە پێغمبەری بەرێ خۆ بدە ( مسجد الاقسی ) بۆ نڤێژێ .

ئەگەر بێژی یا دووێ بیە و اجتهادا خۆ بیە ، ئەڤە وێ چەندێ دسەلمینیت رەئیا پێغمبەری بەشەک بیە ژ دینی و دبیت دین لسەر مە حەدیسێن وی

یانژی دڤیا بێژی یا سێییێ یە و ژ دەرڤەی قورئانێ وەحی یێ بۆ هاتی و ئەڤژی وێ دسەلمینیت فەرموودە بەشەکە ژ دینی چونکی موسلمانا بۆ نڤێژێ بەرێ خۆ یێ دای ( مسجد الاقسی ) بەری ئەڤ ئایەتە بهێت و بەشەک بوویە ژ دینی ئەو نڤێژێن بەر ل ( مسجد الاقسی ) .

ل ڤێرەدێ بێژم دەمێ توو دبێژی فەرموودە بەشەک نیە ژ دینی چەوا دێ خۆ ژ ڤێ مەسەلیێ رزگار کەی ؟ بەرسڤ بلا بۆ هەووە بیت

## بەرسفەک بو (قورئانیا)

ئەری ئەو کەسی باوەری ب( خودی و روژا دوماهیکی و کاریت باش بکەت) ب موسلمان حیسابە واتە بە هشتیە.؟

ئەری ئیسلام بون واتا باوەری ئینان بتنی ب سی روکنایە.؟

دەستپیکی نمونەکا گرنگ: (( لفیری ئەم مناقشی ل سەر قورئانیا و روکنیت ایسلامی))

تو دبینی ئەم بەحسا روکنیت ئیمانی بوتە دکم و نافی روکنی ئیسلامیان بو ددانن.

چونکی ئیمان ژی بەشەکە ژ ئیسلامی .

واتا بەشەکی سەرەکی ئیسلامی ئیمانە..،

مروف ژی هەر ژبەر فی بەشی (ئیمان) دچیت بەهشتی،چونکی بەشی عەمەلی وەکو نفیژ و روژی و زکات و حەج چ مفایی وان نینە بێ ئیمان کو بەشەکی سەرەکیە د ئیسلامی دا..، چونکی هندەک کەس هەنە ب منافق دهینە حیساب کرن بەس ئیمانا وی هوکارە بو چونا بەحشتی.

کا دا دەست ب بابەتی خو بکەن..

قورئانی دبیژن: هەر کەسەکی باوەری ( بخودب و روژا دوماهیکی هەبت و کریارین باش کربت) ئەو ب موسلمان حیسابە و ل قیامەتی ژی جهی وی بەحشتە.

مەبەست هەر چ دین هەبت بوزی جوهی و مەسیحی . هندوسی ج دینی هەبت.

و ل سەر چ دينا ژی نەبت.

ئەو ب حساب بەهشتيە و موسلمانە.!

دبيژن مەرج نينە باوەريا خو ب مەلايكەتا و ب كتيبن خودی و بيغەمبەران بينن؟!!!..

دی دا بزانن بەلگا وان چيە، بەلگا وان ئەو ئايەتا خودای مەزنە ،

خودی دبيژت : (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَىٰ وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)

[سورة البقرة ٦٢]

واتا: هندی خودان (باوەرێن) ڤێ ئوممەتێنە، يێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی ئينای، وكار ب شريعەتێ وێ كری، وئەوێن بەری هنارتنا موحەممەدی سلاڤ لێ بن بووينە ژ جوهی، وفەلە، وصابئييان -وئەو مللەتەكن ل سەر خوڕستييا خۆ ماينە، وچو دينێن دەسنيشانكری بۆ وان نەبوون ئەو ل دويڤ بچن- ئەوێن هە هەمی ئەگەر ب دورستی باوەرييێ ب خودێ، و ب ڕۆژا دويماهييێ بينن، وكارەكێ ل نك خودێ چاك بكەن، جزايێ وان ل نك خودايێ وان هەيە، وترسا ل سەر پاشەڕۆژێ وپەشێمانييا ل سەر ڕۆژێن بۆری ناگەهتە وان.

دبيژن اها ل فی ئايەتی بتنی سی مەرج بەحس لی هاتنە كرن.

كەواتا بتنی ئەڤە روكنيت ئيسلامی نە.

باشە : هەوە ژ كيڤە ئيناتە كو ئەو ئايەتە بەحسی روكنيت ئيسلامی دكەت ب چ بەلگە،؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ب پشتراشتی دێ بێژن ئاخر نابینن سوزا پاداشت و تشتێن باش یێن دایێ بەرامبەر بتنێ ئەوان سێ تشتا .؟

ئەمژی دی بیژن ئەری هوین چ دبیژن ئەگەر ئایەتەکی ژ قورئانی بینن و سوزا وی ژ ئایەتا هەوە باشتر بو و باوەری هەر ب (روژا دوماهیکی تیدا نەبت).

خودای مەزن دبیژت:(وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ)[سورة التغابن ٩] واتا : هەچییێ باوەرییێ ب خودێ بینت وگوهدارییا وی بکەت، ئەو دێ گونەهێن وی بۆ وی ژێ بەت، ودێ وی کەتە د وان بەحەشتان دا یێن ڕوبیار د بن قەسرێن وان دا دچن، هەر وهەر ئەو دێ تێدا مینن، ئەو هەرمانا د بەحەشتان دا سەرکەفتنا مەزنە یا چو سەرکەفتن د دویڤ دا نەهەین.

بەری خو ب دەنە وی ئایەتی چەند سوزا رون و ئاشکرا ب وان د دەت ئەوین باوەری بخودی هەبت و کارین باش بکەت، فیجا چ جوهی بت یان چ دین یان موسلمان بت ....هتدد بو هەمیان دهیت چونکی پیتا (ومن) تیدا یە کو گشتیە.

سوزا فی ئایەتی گەلەک رون ترە ژ یا هەوە ئیناتی. ئەری چیدبت ئەمژی وەکو جەنابی هەوە دەست ب فان ئایەتا بگرن و ئایەتین دی پشت گوهی خوفە بافین و بیژن واللە ئەو ئایەت بەحس ژ روکینن ئیسلامی دکەت و هەرکەسی باوەری ب خودی هەبت و کریارین باش بکەت ئەو موسلمانە و بلا باوەری ب روژا دوماهیکی ژی نەبت چونکو د ئایەتی دا بەحس لی نەکرە ئەو بەحشتیە ئەری چیدبت؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

پسیارەک دی : هوین دبیژن باوەری هەبون بیغەمبەران و مەلائیکەتا و کتیب و ئایەتین خودی واجب نینە بو کەسەکی کو بفیت بچیت بەحشتی و نافی وی ببت موسلمان.

نوکە دی هندەک ئایەتین قورئانی بو هەوە ئینن مادەم هوین قورئانینە و گوهی خو دنە قورئانی.

هەر ئەو ئایەتین بەحسی(ئیسلامی) تیدا یە بەرسفا هەوە دەت وو نەئەم قورئان ب خو.

خودی بەحسا ئیسلامی دکەت و دبیژت: (إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ۗ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَنْ يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ)[سورة آل عمران ١٩]واتا: هندی ئەو دینە یێ خودێ بۆ بەنییێن خۆ پێ ڕازی بووی وپێغەمبەرێن خۆ پێ هنارتین وو و ژبلی وی ئەو ب چو دینێن دی ڕازی نابت، ئیسلامە، وئیسلام ئەوە مرۆڤ عیبادەتی بۆ خودێ ب تنێ بکەت وخۆ تەسلیمی وی بکەت وو ودویچوونا پێغەمبەران بکەت. وئەوێن کیتاب بۆ هاتی ژ جوهی وفەلان ب خیلاف نەچوون، ونەبوونە پارت ودەستەکێن لێککەفتی حەتا ب هنارتنا پێغەمبەران وئینانە خوارا کیتابان هێجەت بۆ وان نەمای؛ ژ بەر چاڤ پێ نەڕابوون وداخوازکرنا وان بۆ دنیایێ. وهەچییێ باوەرییێ ب وان ئایەتێن خودێ نەئینت یێن هاتینەخوارێ وخوداینییا وی ئاشکەرا دکەن وو هندی خودێیە حسێبا وی یا ب لەزە، وئەو سەرا کارێ وان دکر دێ جزایێ وان دەت .

باشە هوین دبینن ئەو ئایەتا بەحسی ئیسلامی دکەت چاوا هەرەشە ل وی کەسی دکەت کو (باوەری ب کتیب و ئایەتین خودی نینە)؟

باشە دا ئایەتەکادی بو هەوە بینن ئەوژی بەحسا ئیسلامی دکەت، و بزانینن ئایەیاتە ژبەری وی چ دبیژت، خودی دبیژت: (قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَالنَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ * وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) [سورة آل عمران ٨٤ - ٨٥]

٨٤) تو -ئەی پێغەمبەر- بێژە وان: مە باوەری ب خودێ ئینایە وگوهدارییا وی کرییە، ڤێجا ژ وی پێڤەتر مە چو خودا نینن، و ژ بلی وی ئەم پەرستنا کەسێ دی ناکەین، ومە باوەری ب وێ وەحییێ ئینایە یا خودێ ل سەر مە ئینایە خوارێ، و ب وێ یا ل سەر خۆشتڤییێ خودێ ئیبراهیمی، وهەر دو کوڕێن وی ئیسماعیلی وئیسحاقی، ونەڤییێ وی یەعقووبێ کوڕێ ئیسحاقی، هاتییە خوارێ، و ب وێ یا ل سەر ئەسباتان هاتییە خوارێ وئەو ئەو پێغەمبەر بوون یێن د ناڤ هەر دووازدە ئویجاخێن ئسرائیلییان دا ژ عەیالێ یەعقووبی هاتینە هنارتن- و ب وێ یا بۆ مووسا وعیسایی ژ تەوراتێ وئنجیلێ هاتییە خوارێ، و ب وێ یا خودێ بۆ پێغەمبەرێن خۆ ئینایە خوارێ، ئەم باوەرییێ ب وێ هەمییێ دئینین، وچو جوداهییێ نائێخینە د ناڤبەرا ئێك ژ وان دا، وئەم د فەرمانا وی ب تنێ داینە، گوهدارییا وی دکەین، وشاهدەییێ ب خوداینییێ وپەرستنێ بۆ وی ددەین.

(٨٥) وهەچییێ دینەکی ژ بلی ئیسلامێ داخواز بکەت، وئیسلام ئەوە مرۆڤ ب تەوحیدێ وگوهدارییێ خۆ تەسلیمی خودێ بکەت، وباوەرییێ ب پێغەمبەرێ دویماهییێ موحەممەدی سلاڤ لێ بن بینت، ودویچوونا وی بکەت، وڤەشارتی وئاشکەرا ئەو بڤێت، هەچییێ دینەکی دێ داخواز بکەت ئەو دین ژ وی نائێتە قەبویلکرن، وئەو ل ئاخرەتێ ژ زیانکارانە ئەوێن پشك وبارێن خۆ ژ دەست داین وو

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هەوە دیت؟ ئەو ئایەتە کو خودای مە خەلکی فیر دکەت کو باوەری ب هەمیی کتیبین خودی بینن و پاشان دبیژت (دینی بهیتە وەرگرتن(قبول)کرن ژ لایی خودی فە بتني ئیسلامە) ،

باشە ئەگەر باوەری بون بتنی ب پیغەمبەران و کتیبیت خودی بەشەکی سەرەکی نەبت ژ ئیسلامی بوچی هوسا ب پیکفە بەحس لی هاتنە کرن ؟

باشە ئەوی ئایەتی گوت ئەوی ل سەر ئیسلامی نەبت ژ زەرەرمەندایە،

دی دا سەحکن فی ئایەتی ژی ،

خودی دبیژت: (وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[سورة يونس ٩٥]واتا: نەکو بچیە ریزا وان کەسان باوەری ب موعجیزە و نیشانیت و گوتنیت خودی نەبت، چونکو ئەگەر وەسابی، دی چیە ریزا خوسارەت و زەرەرمەندادا.،

باشە ئەگەر باوەریبون ب کتیبین خودی بەشەکی سەرەکی نەبن ژ ئیسلامی بوچی ئەو ئایەتە دبیژت ئەگەر باوەریی پی نەئینی ژ خوسارەتاییی؟ خو ئیسلامەتیەت خوسارەتی تیدا نینە ؟

بەلگا عەقلی: دی دا بەلگەکا عەقلی ژی بو هەوە بینن ل سەر واجبین ئیمان هەبون ب (کتیبین خودی و مەلایاکەتان و پیغەمبەران)

بەلگە ئەوە : باشە برای ب ناف قورعانی تو نابیژی(دینی بهیتە وەرگرتن بتنی ئیسلامە)؟

بەلی.

ئەری چاوا دی (دیندار) زانت ئەری مانە بتنی ب پەرتوکا خودی دی زانت؟

بەلی.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەری مانە پەرتوک ب ریکا پیغەمبەرا دهیتە خوار؟

دی بلا بەلی.

ئەری کی وەحی بو پیغەمبەری ئینات ئەگەر مەلائیکەت نەبت؟

بەلی ئەوژی مەلائیکەتە.

ئی عزیزی برا دەما فان تشتان دزانی چاوا دەما کەسەکی باوەری ب فان تشتان نەبت حیساب دکی موسلمان(ئانکو بەحشتی)؟

چونکو تەباوەری ب ایک ژفان نەبت ئەو تو ژ زەرەرمەندایی

فیجا ئەری تو دزانی ئەو ئایەتا هوین دکەن بەلگە بو روکنی ئیسلامی، ئەری دزانی شیوەیەک ژ شیوازین.(باوەری بون ب کتیبین خودی و مەلائیکەتا و ب پیغەمبەراژی تیدایە دبیژت دفیت باوەریا هەوە ب روژا دوماهیکی بهیت) ئی باشە چاوا باوەری ب روژا دوماهیکی د ئینی؟ئەگەر ب ریکا وەحی و مەلائیکەتا و کتیبا خودی و پیغەمبەران نەبت؟؟

فیجا دبیژم قورئان هەموو تەمامکەرێت ئیکدوونە نابیت ئایەتەکێ وەرگرن یا دی پشت گوهێ خوڤە ب هاڤێن

سەحکە فی ئایەتی ،

خودای مەزن دبیژت: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ ۖ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ)[سورة الأعراف ١٥٨]

واتا : تو -ئەی پێغەمبەر- بێژە هەمی مرۆڤان: هندی ئەزم ئەز پێغەمبەرێ خودێ مە بۆ هەوە هەمییان نەکو بۆ هندەکان ب تنێ، ئەو خودایێ ملکێ

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

عەسمانان وعەردی وهەر تشتەکێ د ناڤ دا یێ وی، نابت خوداینی وپەرستن بۆ ئێکێ دی بت ژ بلی وی، ئەو یێ خودان شیانە کو چێکرییان بدەت وببەت وجارەکا دی زێندی بکەت، ڤێجا هوین باوەرییێ ب خودێ وتەوحیدا وی بینن، وباوەرییێ ب پێغەمبەرێ وی موحەممەدی سلاڤ لێ بن بینن، ئەو پێغەمبەرێ نەخواندەڤا یێ کو باوەرییێ ب خودێ دئینت، و ب وێ یا بۆ وی ژ نك خودایێ وی هاتی، و ب وێ یا بۆ پێغەمبەرێن بەری وی هاتی، وهوین دویکەفتنا ڤی پێغەمبەری بکەن، وکاری ب وێ بکەن یا ئەو فەرمانێ پێ ل هەوە دکەت؛ دا بەلکی بەرێ هەوە بۆ ڕێکا ڕاست بێتەدان.

باشە ئەگەر جوهی و دینین دی. وهەر کەسەکی حەز نەکت باوەری ب پیغەمبەری ب ئینن ، بوچی خودایی مەزن فەرمان ل هەمی خەلکی دکەت باوەری ب پیغەمبەری ب ئینن و ل دیف هەرن.

باشە برای بناف قورئانی ئەگەر باوەری بون ب قورعانی مهیم نینە بو جهیان و دینین دی بوچی خودای مەزن دبیژت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰ أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا)[سورة النساء ٤٧]

واتا: گەلی کیتابییان، باوەرییێ ب وێ بینن یا مە د قورئانێ دا ئینایە خوارێ وکاری پێ بکەن، ئەو قورئانا ڕاستگۆییا وێ یا د گەل هەوە ژ کیتابان دیار دکەت، بەری کو ئەم هەوە ب خرابیا کارێ هەوە بگرین، ڤێجا هندەك ڕوییان حلی بکەین ووەرگێڕینە پاتکێ، یان لەعنەتێ ل ڤان خرابکاران بکەین کو وان بکەینە مەیموینك وبەراز، وەکی مە لەعنەت ل جوهییێن خودانێن شەنبییێ کری، ئەوێن ژ ڕاڤ ونێچیرا ل شەنبییێ هاتینە پاشڤەبرن بەلێ ئەو پاشڤە نەچوون، ئینا خودێ ل وان ب غەزەب هات، وئەو ژ ڕەحما خۆ دەرێخستن، وفەرمانا خودێ د هەمی حالان دا فەرمانەکا ب جهـ هاتی بوویە.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەف هەرەشە هەمی بوچیە؟؟

و ئەف ئایەتە : وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ (١٢٠) وجوهی وفەلە قەت ژ تە ڕازی نابن -ئەی پێغەمبەر- حەتا تو دینێ خۆ نەهێلی ودویچوونا دینێ وان نەکەی، تو بێژە وان: هندی ئیسلامە ئەوە دینێ دورست. وپشتی ڤێ وەحییا بۆ تە هاتی ئەگەر تو ل دویڤ دلچوونێن وان بچی چو سەرکارەك ل نك خودێ بۆ تە نابت مفای بگەهینتە تە، یان پشتەڤانەك تە ب سەر بێخت. وهەر چەندە ئەڤ گۆتنە بۆ پێغەمبەرییە سلاڤ لێ بن، بەلێ ئەو بۆ هەمی ئوممەتێیە ژی.

بناف قورئانی هەر ل سەر وی بنامایی بو ئیسلامیان ددانن دبیژن :(جوهی و مەسیحی و بوزی و ئەویت ژ ئاینین خو ژی دەرکەفتینە موسلمانن).

و لفیری روکنی ئیسلامی مە ئاشکرا کر کو مەزانی ئیسلام (جوهیا و ئاینین دی) ناگرت..

## قورئانی ( دژە حەدیس ) و عەقل

قورئانی ئەون یێ فەرموودا رەتدکەن و پێوەرێ رەتکرنا وانا عەقلە تنێ عەقلێ وانایە و ئەو دبێژن هەر تشتەکێ دگەل عەقلێ مە نەگونجین ناوەرگرین ، ئەم هەمی دزانین دەمێ مرۆڤ یێ بچیک باش و خرابی مە ژێک جودا نەدکرد ئەگەر تشتەک دەف مە یێ باش با بەلێ دەف دایک و بابێ مە یێ خراب با وانا نەدهێلا ئەم بکەین ئەگەی گەلەک لسەر رشد باین دا هێین قوتان بدەستێ وانا ، بۆچی ؟ چونکی وانا دزانی عەقلێ من وتە ل وێرێ یێ خەلەتە و بریارا راست نادەتن ، ژبەر هندێ دڤیابا ئەم هنگی دیڤ عەقلێ خۆ نەچووباین چونکی بریارێ خەلەت ددان دڤێت دیف یاسایێت دایک و بابا بان و دەمێ چوین قوتابخانێ ل وێرێ ژی ئەگەر مە دیڤ عەقلێ خۆ کربا ل هەمی تشتا هەر تشتێ مە پێ باش با مە کربا و هەر تشتێ لدەف مە خراب با مە نەکربا و چ قیمەت مە بۆ ماموستای نەدانابان دا وێ سالێ مینەڤە ل جهێ خۆ ، چونکی عەقلێ مە خەلەتی دکرن دڤیابا مە گوهێ خۆ دابا ماموستای کا چ بۆمە یێ باشە چ یێ خرابە و پشتی مەزن بووین بۆ چەند زێدەتر ئەڤ کردارێت رۆژانە یێ دهێن سەرێ مە بۆ نموونە سەیارەکا تە خراب بوو و تە برە دەف فیتەری ب عەقلێ تە بیت نابیت هندەک بەشێ وێ سەیارێ ژێ ڤەکەی و باڤێژی بەلێ چونکی فیتەر باشتر دزانیت دڤێت دیڤ یاسایێ وی بچی نەک تنێ ب عەقلێ خۆ بریار بدە ، یانژی توو چی باژێری تە گەلەک پارە هەبن چ تشتێ باشە توو دشێیی بکری بەلێ تە کێم پارە هەبن نەشێیی دیڤ عەقلێ خۆ چ تشتێ باشە وی بکری دڤیا دیف وی پارەی بکری یێ تە ڤێ کا چەندە .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤە هندەک نموونە بوون کوو نابیت ژ ڤان تشتێ سادە تنێ توو عەقلێ خۆ بکار بینی چنکی کی هەیە ل دنیایێ عەقلێ وی نەکەڤیت خەلەتیێ ؟؟ کەس نینە بێ گومان ، ئەگەر عەقلی بتنێ بکەیە پیڤەر بەلکی هەتا جهەکی بچی ب راستی بەس دێ ل جهەکی هەر تێ کەڤی ، ئێک نموونا دی مە جۆرە کۆترەک یێ هەی دبێژنێ زاجل کوو ئەگەر توو هزار کیلۆمەترا ژی دیر بێخی ژ مالا خۆ و پاشی بفرینی دێ هەر زڤریت مالاتە ، دێ وەرە ڤێ نموونێ بۆمن ب عەقلی شلۆڤە بکە چ عەقلەک تەقەبولا ڤێ دکەت ئەڤ کۆترە چەوا زڤری ؟؟ ئەڤەو هزار نموونێ دی کوو نەشێی تنێ ب عەقلی شلۆڤە بکەی

ئەگەر توو بۆ ڤان تشتا نەشێی عەقلی تنێ بکار بینی ئەرێ معقولە بۆ دینەکێ هندێ مەزن کوو ئیسلامە هەر حەدیسا هاتە پێش چاڤێ تە و بدلێ عەقلێ تە نەبی توو بێژی درەوە و بوختانە و توو هەمی حەدیسا دیڤ عەقلێ خۆ شلۆڤە بکەی !!؟ ئەڤە رێزگرتنە ژ ڤی دینێ هندێ مەزن ، باشە فەرقا تە و بێدینەکی چیە هین هەردووک تنێ عەقلێ خۆ دکەن پیڤەر بۆ رەتکرنا بابەتا ! مە ل ئیسلامێ بۆ حەدیسێ هندەک پیڤەر یێ دانای بۆ نموونە علم الرجل ئانکۆ بەحسێ وانایە کا ئەو کی بینە حەدیس ژێ هاتیە ڤەگێران و زانایێت وەکی بوخاری و موسلیم..... بێن دی بۆ هەر حەدیسەکێ هەیڤا ل دیڤ دگەریان دچونە دەف کەسەکی دا بێژنێ ژ کێ تە گوهـ لێ بیە ئەوژی دا بێژیت فلان کەسی پاشی دا چنە دەف وی کەسی دا تەکید کەنەڤە و بۆ هەر حەدیسەکێ ژ چەندین کەسا وەردگرت و پرسیار پێدکرد هەتا متەکد بن ، بەلێ دگەل هندێ ژی کەسەکێ وەکی زانای ابن حجر عسقلانی دبێژیت ل کتێبا بوخاری ٨٠ حدیس یێ هەین جهێ هندێیە مرۆڤ لسەر راوەستیت ، نابێژیت خەلەتە دبێژیت لسەر راوەستین و دبێژیت ل کتێبا موسلمی ١٢٠ حەدیس یێ هەین مرۆڤ لسەر راوەستیت .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

تێبینی کەس ب ئاخفتنا وانا نەخەلەتێت دەمێ دبێژن ئەم وان حەدیسا وەرناگرین یێ دگەل ئەخلاقێ پێغمبەری نەگونجێت و یان دگەل قورئانێ دژ نەبیت ، کێ گۆتیە حەدیس دژی قورئانێیە یان فلان حەدیس دورە ژ ئەخلاقێ پێغمبەری و ئەم بەرگریێ ژێ بکەین !!؟ نەخێر ئەڤا توو دبێژی تنێ فێلبازی کرنە ژ خەلکی توو دکەی .

ل ڤێرە دپرسم پیڤەرێ تە چیە توو حەدیسێ رەتکەیەڤە تە شارزای د چ دا هەیە توو چ فقهـ و علم الرجال دزانی ؟. توو چەوا ب عەقلێ خۆ دێ دیارکەی کا دژی قورئانێیە یان نە !! تە شارزای د چ دا هەیە هەتا توو بریارێ لسەر بدەی کا چەوایە فەرموو مە یاسا و علم یێ هەی بۆ زانینا راستی و دروستیا حەدیسێ بەلێ تە چ هەیە ؟

ئەگەر تنێ بێژی تنێ قورئان ئەز دێ ئێک نموونە بۆتە بێژم ل ئایەتا ١١٨ یا سورەتا التوبە بەحسل کێ ٣ کەسا دکەت ، کا بێژە مە ئەو سێ کەس کینە و ناڤێ وان چیە سەرهاتیا وانا چیە ؟

بۆ زانین بەحسێ چیرۆکێ قورئانێ بۆمە نەکە چنکی ئەڤ روداوە ل سەردەمی وەحی یا روودای و چیرۆکێ قورئانێ ١٠٠٠ بەری ئیسلامێ یێ رودانیە .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

## خوڕافاتا قورئانێ و مانا دزكێ حویتی دا ؟!

وەكی ئەم دبینین وێنێن جۆراوجور دهێنە چێكرن و بەلاڤكرن و تڕانە ب ڤێ سەرهاتیێ دهێنەكڕن كو یونس پێغەمبەر سلاڤ لێ بن پشتی ژ ناڤ مللەتێ خۆە دەركەفتی و ددەریایێ دا حویتی داعیرای ..... و هتد..،

و بێ دین ژی دبێژن موسلمان خشیمن و باوەر ژ هەمی تشتەكی دكەن !!

دا سەحكەینێ كا كی خشیمە و نەزانە

و بێ ئاگەهە ژ ڕویدانێن سەیر و سەمەر..

بـــەڵـــــــێ

ل زڤستانا ساڵا ١٨٩١" كەسەک ب ناڤێ "james bartley" ل تەمەنێ ٢١ ساڵیێ دا

توشی ڤێ ڕویدانا سەیر دبیت و حویت ڤی كەسی دادعیریت ب هەمان شێوەیێ یونس پێغەمبەر هاتیە داعیران ،قورئان دبێژیت:

یونسی د تاریەكا گشتی دا دزكێ حۆیتی دا دوعا ژ خۆدای كر، دسێ تاریادا. تاریا شەڤێ و تاریا دەریای و تاریا زكێ حۆیتی..

وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ} [الأنبياء : ٨٧]

ئەڤ كەسە ژی دزكێ حۆیتی دا بوو

و دتاریەكا گشتی دا بوو،

swallowed by the whale, was that remained in total darkn،

ژێدەرێ درێژیا بابەتی..⬇️

https://www.exponav.org/james-bartley-el-hombre-que-vivio-dentro-de-una-ballena/?lang=en

هوین بخۆە ژی دشێن بتنێ ناڤی وی بنڤێسن

ل گوگلی دێ بابەت هەمی هێتە خار..

هەروەسا ڕۆژنامەیەکا فەڕەنسی ژی ب ناڤێ "Le Deuxieme Jonas" باسێ ڤێ ڕویدانێ کریە

و ل ٢٧ی October ێ ساڵا ٢٠٠٩ " ئەڤ ڕویدانە هاتیە بەڵاڤ کرن ژلایێ دکتۆر .

،Prometheus Haphazard

Dr. Prometheus Haphazard lost his footing while preparing a remote robotic submarine for its maiden voyage, and fell into the sea. Remarkably, a blue whale accidentally swallowed him whole

ژێدەرێ درێژیا بابەتی..

http://uncyclopedia.wikia.com/wiki/UnNews:Scientist_swallowed_by_whale,_survived_undigested

و هەروەسا David Guston: دناڤ زکێ حویتی دا یێ ژیای دپەرتوکا "Modern Folklor" دلاپەڕە ١٧٨" باسێ ڤێ چەندێ کریە..

وە هەروەسا "Luigi Marquez"ێ ئیسپانی تەمەنێ وی ٦٥ ساڵە و بوو ماوێ ٧٢ دەمژمێرا واتە ٣ ڕۆژا یێ ناڤ زکێ حویتی دا ژیای و خێزانا وی هزردکر ئەو یێ مری....

ژێدەرێ درێژیا بابەتی...⬇️

https://www.scoopwhoop.com/Man-Swallowed-By-A-Whale-Lives-To-Tell-The-Story/#.8mdw6gsv3

نموونە و بەڵگە هێشتا هەنە بەلێ ئەڤە بەسن ئەگەر بێ دینی دڤێت ڕاستیێ بزانیت.......

## بۆچی خودێی کێم ئەندام دروست کرینە

گەلەک جارا ئەم دبینین کەسەکی ئەندامەک کێمە بۆ نموونە دەستەک یان پێیەک یان ژی نابیستیت یانژی نابینیت ژبەر هندێ ئەڤ کەسە گەلەک جارا دبێژیت خودێ بۆچی تە ئەز کێم ـەندام چێکرمە ( مە ژبیر نەچیت دبیت ژ بەر رودانەکی کێم ئەندام بووبی بۆ نمونە شەر یان خەلەتیەکا دکتۆری یان هەر تشتەکی دی ، کێمەک ژ بنەرەت کێم ئەندامن بەلێ ئەم دێ بگشتی بەحس کەین ) .

ئەڤ کەسێ کێم ئەندام ژبەر کاریگەریا دەور وبەرێ وی گەلەک جارا توشی نارەحەتی دبیت و دبێژیت بۆچی تنێ ئەز وسامە ژ ڤان هەمیا یێ دەوروبەرێ من !

وسا بهینە پێش چاڤێ خۆ کەسەکی دنیاسی یێ جلکا د دروت ( خیاطە ) ئەڤ خەیاطە گەلەکی بناڤ و دەنگە و ناڤ و دەنگێ وی یێ ژ هەمی ولاتی بلاڤ بووی ڤی خیاطی کەسەک یێ ژ دەف یێ فەقیرە و جل و بەرگ نینە ، بەلێ ئەڤ خیاطە یێ هاتی ئەڤ فەقیرە ئینای دەف خۆ و رۆژانە جلکا دکەت بەر وی و ب قیاسا وی دپیڤیت هندەک جارا جلکێت ژبەر وی کورت دکەت و هندەک جارا درێژ حەتا بزانیت قیاسا وان جلکا چەوایە و چەوا نایاب دێ ئێن ، ئەڤ فەقیرە بەردەوام لسەر حسێبا وی دژیت و جلکێت وی بێ بەرامبەرن ، بەلێ ئەگەر گریمان وی خیاطی رۆژەکێ جلکەکێ وی کورت کرد یان کێماسیەک تێدا کر هەتا بزانیت دێ چەوا جلک دەرکەڤن ، و ئەو فەقیر بێژیتێ ۆ ئەڤە چیە توو بۆچی وەدکەی و تە کێماسیەک یا خستیە جلکێ من ؟؟ بۆچی توو وەدکەی ؟؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەز دپرسم ئەرێ ڤی خیاطی ماف نینه بێژیته وی فەقیری ماته چ تشت هەبی ؟ من توو ژ فەقیریێ و نەبوونێ رزگار کری و من شەڤ و رۆژ جلک ددانه ته بێ بەرامبەر نوکەژی یێ نەرازی !

ئەڤ نموونه دڤێت هەردەم ل بیرامه بیت و هزر بکەی کوو خودایێ مەزن ئەم یێ ژ نەبوونێ ئینابنه هەبوونێ و ئەم خودانێ چ نەبووین خودایێ مەزن ئەڤ هەمی نیعمەته دگەل مه کرینه ، ئەگەر کەسەکی ئەندامەک کێم ڤێجا ب هەر هۆکارەکێ بیت ئەرێ چ لۆژیکی تێدایه ئەم بێژینه خودێی بۆچی ته ئەم کێم ئەندام کرین ، ئەرێ خودێی حەق نینه بێژیتەمه هین چ نەبوون من هەوه ئینانه بوونێ ! ئەگەر ئەم هزرا خۆژی بکەین ئەم هەمی قەترەکا ئاڤا پیس بین خودایێ مەزن ئەم ئینانه ڤی شێوازێ رێک و پێک .

خالەکادی دڤێت بزانین ئەگەر ئەم بۆ حەتا حەتایێ ژیاباین هنگی دبیت مرۆڤ نارەحەت ببا ئەژی دگەل تەمه ژ وێ چەندێ چنکی بۆ حەتا حەتا مرۆڤ یێ کێم ئەندام بیت گەلەک زەحمەته بەلێ وەکی دبینین ژیان یا کێمه چەند سالەکن پشتی هنگی قیامەته بۆ حەتا حەتایێ کوو کێم ئەندامی ل وێرێ نیه و ل دوماهیێ دێ دوو مزگینییێ پێغەمبەرێ خودێی محمد صل الله علیه وسلم بێژین لسەر کێم ئەنداما یا ئێکێ دبێژیت ( دەمێ خودێ پاداشتا کێم ئەنداما ددەتەڤەل رۆژا دوماهیێ ، ئەو کەسێ کێم ئەندام نینه ڤێ چەندێ دبینن هیڤیێ دخازن واناژی ل دنیایێ ب ئامێرێ تیژ تیژ لەشێ وان هاتبا پارچه پارچه کرن ! )ترمزی .

توو بێژی ئەڤه چ پاداشتا هندا مەزنه بۆ کێم ئەنداما .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

خودایێ مەزن د فەرموودەکا قودسیدا دبێژیت ( ئەگەر هەردوو ئەندامێ خۆشتڤی ( هەردوو چاڤا ) ژ عەبدێ خۆ وەرگرم و ئەوژی سەبرێ لسەر بگریت ، ئەڤە ل شینا وان هەردوو چاڤا دێ بەحەشتێ دەمێ ) بوخاری

جارەکێ ئافرەتەک هاتە دەف پێغمبەرێ خودێی صل الله علیه وسلم وێ ژنێ نەخۆشیەک هەبی ئاگەهـ ژخۆ نەدما هاتە دەف پێغمبەری و داخازیەک ژێکر : ( ئەی پێغمبەرێ خودێی من نەخۆشیەک یا هەی کوو من هاش خۆ نامینیت و دوعایا بۆمن بکە ئەز چێببمەڤە )

پێغمبەرێ خودێی فەرموو ( ئەگەر تە پێ خۆش بیت دێ دوعایا بۆتە کەم دێ چاک بیەڤە و دێ رزگار بی ژ نەخۆشیێ ، ئەگەر ژی تە پێ خۆش بیت سەبرێ بگرەو بەهەشتێ بدەست خۆڤە بینە )

وێ ئافرەتا دان عەمر ژی بەرسڤ دا و گۆت (( ئەی پێغمبەرێ خودێی !! ژبەرکو پاداشتێ صەبر گرتنێ هندێ مەزنە ئەڤە من بریار دا صەبرێ بگرم . بەلێ دەمێ ئەو نخۆشی بۆمن دهێت من هاش خۆ نامینیت و جل وبەرگێ خۆ ژبەر خۆ دکەم ، دوعایا بۆمن بکە حەتا جل و بەرگێ خۆ ژبەر خۆ نەکەم ).

پێغمبەرێ خودێی دوعا بۆکرن ب ڤی شێوەێ .....

بێ شک خودایێ مەزن هەردەم دوعایا وی قبول کر .....

## ئەرێ پێغەمبەری خەلکێ مەدینی کوشتیە

ملحدەك د بێژیت پێغەمبەری خەلکێ مەدینی کوشتیە ، و ئێک ژ گرتە فیدیویان ملحودەکێ دی دبێژیت ئیسلام ڕێگا ب ئازادیا رەخنەگرتیان نەدایە و د بێژیت و محمدی رەخنەگرتی کوشتینە و قەبول نەکرینە ڕەخنێ لێ بگرن و وەکی وان ڕەخنەگران (کعبێ کوڕێ اشرەف ) ە ، پێغەمبەری فەرمانا کوشتنا وێ دا ، ژ بەر هندێ کاک ملحد زور دلتەنگ بوویە ب وی تشتی و هوسا خو دیارکر زور مروف دوستە .

ل دەستپێکێ دا بزانین (کعبێ کورێ اشرەف کییە ؟) ئەوێ کاک ملحد بوو عێجز ووی .

کعبێ کورێ اشرەف ئێک بوو ژ بنەمالا مەزنا ( بنو نضیز ) ، ( بنو نضیز ) مەجموعەك بوون ژ جولەکە (یهودی) یان ، ل وی دەمێ پێغەمبەر (س.خ) هاتیە ناف مەدینێ پێگڤە عەقدەك ئیمزاکر و سوزەک دا کو کەس ژ وان نەخوشی بوو کەسێ جێنەکەن ، و پێغەمبەری (س.خ) جزئیەژی ژی نە ستاند و هیچ تشتەک (جزئیە ژ یەهودیان نە ستاند) و هەر وەسا دەستهەلات ژی هەبوو ، کەعبێ کورێ اشرەف سیلەح د فروشتە هەردوو بنەمالان (ئەوس) و (خەزرەج) کو شەری بکەن ئێک و دوو بکوژن و فتنەجی ترین کەس بوو ، ئەف مولحدەژی پشتاوی کرن و د بێژن پاشترین کەس بو ۆ یێ پاقژ بوو و ب تنێ شعر د گووتن

دا بزانین بووچی پێغەمبەی فەرمانا کوشتنا وی دا ؟

ئەری تن ژ بەر هندی بوو کو ڕەخنەکرتیە ؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بێگومان نەخێر ، عەزیزان خودێ دەڤێ فیرعەونی نە گرت دەمێ د گووت و د قورئانێ دا هاتی ( انا ربکم الاعلی ) واتە ئەس خودایێ هەوە مە ، نوکە ( کعبی کوڕی اشرەف) کیە هەتا دەڤێ وی بهێتە گرتن ! ئەرێ بەس ژ بەر هندی کوو شعر گووتینە ، ئەگەر هوسا بیت کەواتە پێغەمبەر زالمە !
مەوزوع ئەو نینە ، بەلێ ئەڤ ملحدە تنێ درەوا د زانن .

وەکی مە گووتی کعبی کوڕی اشرف سیلەح د فروتە هەردوو هوزان (ئەوس)ٚ و ( خەزرەج ) کو شەری بکەن و بوو هندێ ئێک دوو بکوژن .......

پێغەمبەر س.خ هاتە ناف مەدینێ ئەڤ هەردوو هوزە پێکئینان و ئاشکرن و کرنە برایێن ئێک ، ئەو جەند سال بوو ئیک و دوو د کوشت ......

دەمێ (کعبێ کوڕێ اشرەف ) دفیا ب کوژن هوزاوی (بنو نضیز ) هاتنە لایێ پێغەمبەری (س.خ) و گووت مە هیچ عەلاقەتەک ب ڤی کەسی نینە ئەو کەسەکێ فتنەجی و دەڤ پیسە ، جولەکە(یهودی) ب خوو تف و نەعلەتا لێ دکەن ، بەڵێ ماشاء الله ئەڤ مولحدە دیفاح ژێ د کەن .....

دەمێ کعبێ کورێ اشرەفی دیتی پێغەمبەری (س.خ) (ئەوس ) و( خەزرەج ) پێکئینان و کرنە برایێن ئێک ، بووی باش نە بوو جونکە بازارێ جەکێ وی لاواز بوو ، قەلایەک هەبوو ل نێزیک (خەیبەر ) چوو وێرێ و د وێرێ ژی را جوو مەککەهێ ، بوو ئەگەرێ پالدانا مشرک و کافران دا بوو وێ یەکێ چێش و هێز کومبن هیرش بکەن سەر مەدینە و موسلمانان بکوژن .......

ل دەمەکی دا موسلمانان ژ جهێ خوو دەرخست بوون و دەربەدەر کربوون و مال و سەروەتێ موسلمانان تاڵان کر بوو ، بەلێ کاکێ ملحد د فیا وێ پێشان ب دەت پێغەمبەر س.خ تیرورستە و کعبێ کورێ اشرەف زەلامەکێ باشە .
کەعبێ کورێ اشرەف هاری ئەبوسفیانی کر کوو ب چەکێ کعبی کورێ

اشرف(انکو ب چەکێ وی ) هێرشێ بکەتە سەر (ئەوس ) و (خەزرەج ) و ئەزیەد بدەن و ماڵ و بیستانێن وان بسوژن ، یا ژ ڤێ ئازار تر کعبێ کورێ اشرەف شعرێن سکسی و خیلاعی ب سەر قاج و مەمک و سینگێ خێزانا پێغەمبەری دا گووتیە ، باشە کی دێ ڤێ قەبیل کەت ؟ کاک ملحد توو قەبیل دکەی دیارە لەومان پشتگیریا وی دکەی ......

پشی هینگی ئەو قەومە ژێ بێزار بوون و خەلک بێزار بوو ژ خەلک کوشتنێ ب سەبەبێ ڤی کابرای ، پێغەمبەری فرمان دا و گووت کی هەیە ئەڤێ فتنێ ژناف ب بەت ، ئەو سەحابیێن رابووین ب کوشتنا (کعبێ کورێ اشرفی ) ژ ماڵا وی ئینادەر و ب مەرەما کرینا چەکی و ئەوسەحابیێن بەرێز ئەفە بوون ( محمد کوری مەسڵەمە ) و ( حارسێ کورێ زیڕار ) و ( ابو ناایلە بو کو برایێ کعبی کورێ اشرفی بوو یێ شیری ) پاش کوشت کعبێ کورێ اشرفی .

عەزیزان ئەفە ئەسلێ بابەتی بوو مولحد ئەفێ د کەنە رەخنە ل سەر ئیسلامێ و وەکی دیار ئەف کابرایە مستەحەقی ڤی سزای بوو ، جونکە جەندەها خەلک دانە کوشت و بێ ئەدەبی بەحسی دەیکا موسلمانان کر ، بەلێ ئەڤ مولحدە دێ بابەتی هێفە ئین و وێفە بەن ، دا بەس موسلمانا مەشغول کەن

**پیغمبەری یێ گۆتیە حەدیسێ نەنڤیسن ؟**

بەرێزان قورئانی بەردوام ڤێ دبێژن کە پێغەمبەرێ خودێ گوتی"" لا تكتبوا عني ومن كتب عني غير القرآن فليمحه"

ژمارە ٣٠٠٤ لە"مسلم "

بەرێزان هەر ئەو فەرموو دەیە بخو بەلگەیە لسەر وان جێبەجێ دبیت نەک بوان چونکی دەقێ فەرموودێ دبێژیت نە نڤێسێن"

بەلێ ژلای منڤە بگەهینن هیچ بەربەسەتەک نینە"

"وحدثوا عنی ولا حرج"

فەرەموو وەختێ ئێک بناڤ قورئانی وێ حدیثێ دکەت کوردی ئەڤ بەشا دیا حدیثێ نانڤێسیت و واتا وێ بومە نابێژیت،

ڤێجا بەرێزان پێغەمبەر(ص) ژبەر هندێ وی وەختی دگۆت وەختێ قورئان دهات خار ژ ترسێت هندێ دا لگەل قورئانێ تێکەل نە بیت ب تایبەتی ئەو کەسێت ژ رێکێت دویر دهاتن ئێک دوو د دیتن و بەیعەت دان و دچون.....

ئەگەر وە بڤێت بەلگێت زور هەنە پێغەمبەر رێگر نەبیە ژ نڤێسینا حدیثا،،.

لە مسند امام احمد ژمارە ٧٠٢٠"

عەمرێ کورێ عاصی گوت پێغەمبەری(ص)هەر تشتێ توو بێژی بنڤێسم ،گوت بەلێ ، ل تورەیی و ئاسایی دا؟پێغەمبەر فەرموو بەلێ ئەز بتنێ حەقی دبێژم.

زەلامەکێ یەمەنی ناڤێ وی "ئەبوشاە"بوو گوە ل وتارا پێغەمبەرێ خودێ گرتبی ل سالا فەتحاها مەککەهێ دا،ئەڤی نە خویندەواری داخازی ژ پێغەمبەری(ص)کر کۆ وتارێ بۆ بنڤسیت،پێغەمبەری گوت ئەبوشاە بنڤێسێن"

## دێ چەوا زانین ئیسلام یا راستە ب فەرموودێ پێغمبەری

النبوءة-دەنگوباسێت غەیبێ بێت ژ نك خودێ هاتین بو پیغەمبەری مە (سلاف لی بن) و هەمی ژی وەسا چێبون.

١- ژبەری شەرێ بەدری ب روژەكێ گوتە موسلمانان ئەم دێ ب سەركەفن.و فلان و فلان دی ژ كافران ئێنە كوشتن...مسلم (٢٨٧٣ ) ، النسائي (٢٠٧٤) وەكو گوتی چێبو

٢-وگوت دێ باژێرێ (خيبر) ب دەستێ على كورى ابو طالبى هێتە رزگارن كرن..البخاري(٢٩٤٢)ومسلم(٢٤٠٦)وەكو گوتی چێبو

٣-ئاخفتن ل سەر دیاربونا كومەكا ژ گوندیێن=زعموا=

رواه ابو داود(٤٦٠٤ )واحمد(١٧١٠٨) وەكو گوتی چێبو

٤-وهەروەها گوتە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم ) ب رزگاركرنا بيت المقدس(قدس) .البخارى(٣١٧٨ ) وەكو گوتی چێبو

٥-هەروەها دەربارى رزگار كرنا (یەمەن) وباژێرێن صنعاء وحضرموت. رواه البخاري (٣٦١٢)

٧-گوتە پێغەمبەری (سلافین خودی ل سەربن) دێ ئومەتا تە زێدە بیت و هێز وشیانێن شەری بێت دژوار هەبن؛ ودێ بەرەف دەریایی فەچن؛ و دەیكا حرام كچا ملحان (خودی ژی رازی بت) دی ژیت هەتا وی سەردەمی؛دوێ رێپیڤانی دا دێهێتە كوشتن.رواه مسلم (١٩١٢) وأبو داود (٢٤٩١)

.وەكو گوتی چێبو

د رزگاركرنا قبرصی دا مر

٨-هەروەها نافێ اویس كوری عامر وشێوازێ وی و دگەل گەلێ (خەلكێ) یەمەنێ هێن ژ الجند و دگەل ئینانا هاریكاریێ.رواه مسلم (٢٥٤٢)

وەكو گوتی چێبو

٩- هەروەها دەرباری رزگار كرنا ( الْحِيرَةِ) ژ ئەردێ عیراقێ . ودێ خەلكێ وێ داخلێ ایسلامێ بن.رواه أحمد (١٨١٧٦) والبخاري (٣٥٩٥) وەكو گوتی چێبو

١٠- هەروەها گوت پشتی رزگاركرنا عیراقێ (كسری) نامینن ل ویرێ و پشتی رزگار كرنا شامێ (قیصر) نامینن ل ویرێ بخاری(٣١٢٠) ومسلم (٢٩١٨)

كسری= ناسناڤێ شاهێت ئیرانێ یە.

قیصر= ناسناڤێ شاهێت رۆمی یە.

١١- ودەرباری رزگاركرنا مصرێ ژی گوتبیی.

أحمد (٢١٤١٢)

١٢-ودەربارێ ئەو کەسێ منافق ژی گوتبیی .

طاعون عمواس رواه البخاری (٣١٧٨ )

١٣- وهەروەها گوتبیێ دێ عمر و عثمان(خودی ژ وان رازیبت)دێ شەهید بن .رواه البخاري (٣٦٨٦) والترمذي (٣٦٩٧)

١٤-هەروەها گوتبی دی عثمان (خودی ژی رازیبت) خلافەتێ وەرگرت و دێ هێتە کوشتن ب دەستێ فتنەچیا و منافقا.. رواه الترمذي (٣٧٠٤) وابن ماجة (١١٢)

١٥-وهەروەها دەربارێی فتنا دنافبەرا علی و معاویە دا (خودي ژوان رازیبت) گوتبیی. رواه الترمذي (٣٧٠٤) وابن ماجة (١١٢) وەکو گوتی چێبو

١٨- هەروەها گوتبی حەسەنی کوری عەلی نامریت هەتا خیلافەتی نەوەرگرت. رواه البخاري (٢٧٠٤) وأحمد (٢٠٣٧٨) وەکو گوتیی چێبو

١٩- دەرباری وان هەردوو کەسێن درەوین و کوژەك (کو دێ گەلەک ژ خەلکێ هێنە کوشتن ) رواه مسلم (٢٥٤٥) وەکو گوتی چێبو

ئەوێ درەوین: مختار کوری ابی عبید ، بو

وئەوێ کوژەک: الحجاج کوری یوسف الثقفي ، بو

٢٠- ودەرباری شەرێن تەتەریا (التتر)ژی گوتبیی .رواه البخاري (٢٩٢٨) ومسلم (٢٩١٢) وەکو گوتیی چێبو

٢١-وهەروەها دەرباری رزگارکرنا قسطنطنیە(استنبول) ژی گوتبیی. رواه أحمد (٦٦٤٥) والدارمي (٤٨٦) وەکو گوتیی چێبو

٢٢-وهەروەسا دەربارى ژێكڤەبونا موسلمانا. ونەمانا هێزا وان .ودێ ئەوين نێزيكـ وان دوژمناتيا ب ئاشكرايى كەن، رواه أبو داود (٤٢٩٧) وأحمد (٢٢٢٩٦) وەكو گوتيى چێبو

٢٣:هەروەها دەربارى ديڤكەتنا بديف جوهيا و فەلەفە ل سەر رێكێن ژيانا وان.. رواه البخاري. (٧٣٢٠) وەكو گوتيى چێبو

٢٤:هەروەها دەربارى دۆرپێچا روم و عەجەما ل سەر عيراق و شام گوتبيى.

رواه مسلم (٢٨٩٦) وەكو گوتيى چێبو

٢٥: هەروەها دەربارى زيدەبونا فەخارنا شەرابێ و زيدەبونا نەزانينێ و نەمانا علم ى . رواه البخاري (٨٠) ومسلم (٢٦٧١) وەكو گوتى چێبو

٢٦:هەروەها زيدەبونا بەلايان. ئەوژى ژئەگەرى كوشتنى و درەوان. رواه ابن ماجة (٣٩٥٩) وەكو گوتى چێبو

[[[وەكو گوتى چيبو. ئانكو چ تشتى ژبەرى رودانى خوداى مەزن گوتى پيغەمبەرى (سلاف لى بن) وەسا رودانە.]

## پشکا ئێکێ

## کۆێله کەنیزەک(عبید)!!!،

گەلەک جارا ئەڤ پرسە دهێتە کرن ؟؟؟

بووچی اسلامێ کۆێلایەتی دروست کریە؟؟! و اسلام دینێ وەکهەڤی و ئازادیێ یە!،

هەلبەت گەلەک گەنج خەلەت دڕولێ اسلامێ دگەهن سەبارەت کۆێلەیان،

ل دەستپێکێ دڤێت بزانین کێشەیا کۆێلەیا گەلەک یا ب زەحمەتە،

دگەل دەرکەفتنا شارستانیێن کەڤن دا دەرکەفتیە و دهەمی سیستەمێن کەڤن دا دانپێدان ب کوێلایەتیێ هاتیە کرن،و گازیێن ئەسمانی ژی ئەوێن بەری اسلامێ هاتین هەتا فەلسەفێن نمونەیی (مثالی)ژی دانپێدان ب ڤی سیستەمی کریە دگەل خڕابیاوێ،

و هزر دوێ چەندێ دا نەکریە کۆ هندەک مافا بدەنە کۆێلەیان ژلایێ سەروەر(سید)ێن وانڤە،

جارێ باسێ شارستانیەتێن کەڤن بکەین ،

شارستانیا یونانیا یێ خاندبیت دێ زانیت چەند پێشکەفتی بین سەرەڕای ڤێ چەندێ ژی ئێکێ ۆەکی ئەرستوی کۆ ب بابێ زانینێ دەهێتە ناڤکرن

دبێژیت،هندەک مروڤ هەنە ل جیهانێ هاتینە چێکرن بوو سەروەریێ و سەرکردایەتیێ و هندەک ژی هاتینە چێکرن بوو گۆهداریێ ،ئەو وەکی ئامیرێن بێ ڕوحن ئەڤێن کار پێ دهێتەکرن،و نزانیت بووچی ڤی کاری دکەت،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤە بووچوونا ئەرستوی یە،

و دکومارا(الجمهوريه)یا افلاطونی دا مروڤ بوو سێ بەشا دهێنە لێکڤەکرن

پشکا ئێکێ، دەستهەڵات دار،

کو افلاتون دبێژیت خۆداوەندن و زێر یێ کریە دناڤ تەڤنا وان دا ،دا بشێن زاڵ ببن و دەستهەڵاتێ بگێرن،

پشکا دووێ، هاریکارێن

دەستهەڵات دارا،کۆ زیڤ یێ کریە دناڤ تەڤنا وان دا،

پشکا سیێ، تەخا کۆێلەیان!!

کو ئاسن دناڤ تەڤنا وان دا هەیە دا ببنە جووتیار و کارکەر،

ئەڤە ژی بووچوونا ئەفلاتونی بوو،

شارستانیەتا ڕومانیا،

دناڤ ڕومانیا دا خودانێن یاساییێن بەرزوبلند! ئەڤێن هەتا نوکەژی دهێتە خاندن ، کوێلە ژ میراتی و خێزانێ(زواج) و مافێ چوونا بەر دادوەرییێ هاتبوون بێ بەهرکرن، و کۆێلە وەکی کەرەستەوکەل و پەل دهاتنە هژمارتن !!نەک وەک مروڤ،

ئەو شارستانیا ڕوما ژی،

دەمێ مەسیحیەت چوویە دناڤ ڕومانیا دا یاسایا ڕومانی داخباڕ بوو ب لێبورینا دینێ مەسیحیەتێ ، ڤێجا بوۆ جارا ئێکێ دمێژوییێ دا حەڕامکر سەروەر کولەیێ خۆە بکۆژیت!!،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

جوهیاتی، دینێ جوهیاتیێ بوو جوهیان درست کر دەمێ ئەو شەڕێ وەڵاتەکێ دکەن و ب سەر دا دگرن ، ژن و زاروکێن وان ئێخسیر بکەن، و درستە زەڵامان ژی بکۆژن و درستە ئێخسیر ژی بکەن دا ببنە کوێلە هەتا هەتایێ ، (سفر التثنية)اصحاحا ٢٠ێ)بخۆینە،

فەلەینی، فەلەینی هات و داخۆاز ژ کۆلەیان کر کۆ گۆهداریا سەروەرێن خۆە بکەن و دناما پوڵسی دا دوپاتی ل سەرڤێ چەندێ هاتیە کرن ،

و ئاریشە ما هوسا هەر ژ دەستپێکا شارستانیەتێ هەتا اسلام هاتی ،

ژ نووی اسلام، باش تێبینیێ ل سەر بکەن دا بوو هەوە دیار بیت کا اسلامێ چەند ڕول گێرایە سەبارەت ڤی بابەتێ مروڤایەتی،و چ چارەسەری بوو دیتیە؟؟؟

## پشکا دوویێ

## کۆیلە،کەنیزەک،(عبید)

اســـلام،

ئێکەمین کوێلە ئازادیا خۆە وەرگرتی داسلامێ دا ،بیلالێ کوڕێ ڕەباحێ حەبەشی بوو،ئەوێ ئەبوو بەکری، کڕی وئازادکری دا ۆی ژ ئەشکەنجەدانێ ڕزگاربکەت،

خواندەڤانێ هێژا ئەگەر تەبڤێت دەرگەهێن مافێن کوێلەیان ببینی و بزانی؟؟ ل ڤان پەرتوکا بزڤڕە،

پەرتوکا(حقائق الاسلام)یا ماموستا (ابراهیم الفلالی)و (شبهات حول الاسلام)یا ماموستا(محمد قوطب)، و (الاسلام والعبید)یا(ابراهیم النعمة)بخوینە،،

دڤێت بزانین کو اسلام دروشما(شعارا)نزانیت بەلکو چارەسەریا ددانیت،ئەز باش دزانم ڕوژهەڵات و ڕوژئاڤا ڤێ کێشێ بوو گەنجێن مە دبێژن و بەرهەم ئینانا کۆێلایەتیێ دکەن ستویێ اسلامێ!!

لێ بەری ئەز بەحسێ هەلویستێ اسلامێ ژ ڤێ ئاریشێ بکەم دێ پرسیارەکێ ژ خۆە و تەکەم خۆاندەڤانێ هێژا؟؟؟

تۆ چ دبێژی بوو گەمیەکێ دنیڤا دەریای دا خراب ببیت،وچ نەمابیت هندی مروڤێن تێدا ب خەندقن،وئەو هەمی گەمیێن ل دەوروبەران ۆێ گەمیا خرابی ڕزگارنەکەن،بەلێ گەمیڤانەکێ زیرەک ب هەمی هێزا خۆە یا هزری و جەستەیی پێکۆلێ بکەت کو هندی بشێت وان مروڤێن دناڤ گەمیێ دا ژ خەندقینێ ڕزگاربکەت؟؟؟

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەرێ تو دبێژی ئەڤ بەرپرسیاریا ئەوێن مرین و وی گەمیڤانی نەشیای وان ڕزگاربکەت،کۆ بهەمی هێزا خۆە پێکۆلا ڕزگارکرنا وان دکر ئەم ڤێ تاوانێ بکەین د ستویێ وی دا؟؟!

ئەز دێ بەرسڤەکا لوژیکی دەم و تو ژی بەرسڤەکا ب وژدان ل سەرڤێ پرسێ بدە

بەرسڤا ڤێ پرسا من کری؟

ب هەر حالێ هەبیت دڤێت ڕێز ل ڤی گەمیڤانی بهێتە گرتن ۆ سپاسیا وی بهێتەکرن،چونکە ئەرکێ ل سەر ملێ خۆە ڕاکر،

بەلێ دەمێ اسلام هاتی دیت کۆ کێشەیا کۆێلەیان یا ژ بن کۆنتڕولێ دەرکەتی و یا بووی کێشەکا جیهانی،

و ژ لایێ مێژوییێ ژی ڤە ئەڤ دیاردە یا کەڤنە و ئالۆزیەکا فرەلایەنی تێداهەیە،ڤێجا پەیرەوەکێ تەمام دەینا بوو چارەسەریا ڤێ کێشێ ،

اسلامێ ئازاتکرن دانا.....وکۆێلایەتی نەدانا(العقاد)

و پەیرەوەکێ تەمام دانا بوو ئازادکرنا کۆێلەیان،

و پەیرەوێ اسلامێ دهێتە لێکڤەکرن بوو سێ پشکا،

ئێک:دابینکرنا ئازادیێ بوو کەسێن ژ ئەسڵ ئازا دانەبنە کۆێلە و نەهێنە کۆێلەکرن،

دوو چارەسەرکرنا ئاریشێ و دانا ئازادیێ بوو کۆێلەیان،

سێ دابینکرنا ژیانا وان کۆێلەیێن هێشتا نەهاتینە ئازادکرن .. و ڕێزگرتن ل وان وەک مروڤ،

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئێکەمین تشت اسلامێ کری ئازادیا کەسێن ئازا دابین کر و ئەڤ چەندە تشتەکێ ب ساناهی نەبوو ، چونکە زاروکێ ئازا دهاتە دزین ژ مروڤێت وی ودهاتە فروتن و دبوو کوێلە،و هەروەسا چێدبیت مروڤێ دەیندار نەشیابا دەینێ خۆە بدەت ڤێجا دابیتە کوێلە بوو وی کەسێ دەین ژێ وەرگرتی،

و ب سەرداگرتن و تالان کرن و دزینا قەبیلێن قورەیشیا پێ ڕادبوون و زاروک و ژن و کەسێن لاواز دکرنە کۆێلە بوو خۆە و ل دەف وان درست بوو،اسلام هات و ئەڤە هەمی حەڕامکر،و ئازادیا کەسێن ئازا ئانکو نەکۆێلە دابینکر، چەوا؟

بەرسڤ،پێغەمبەر سلاڤ ل سەر بن دبێژیت:

عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: "قَالَ اللَّهُ: ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ " ،رواه البخارى،

ئانکو، خودێ دبێژی ئەز دوژمنێ سێ کەسامە ڕوژا قیامەتێ،یێ پەیمان بمن دابیت و پاشی غەدرێ بکەت،وکەسەک مروڤەکێ ئازا ئانکو حوڕ بفروشیت!! هەتا ببیتە کۆێلە و بهایێ وی بخۆت،و مروڤەک ئێکێ ب کرێ بگریت و کرێیا خۆە ژێ بخازیت و ئەو کریا وی نەدەتێ،

و دەمێ اسلامێ ئازادیا ئەوێن ئازا ئانکو حور دابین کری ئەڤە دەوروبەرێن ئاریشێ گرت ۆ نەهێلا پتر ئەڤ ئاگرە بەلاڤەبیت،

ئاریشا وان کەسا ما ل بەر سینگێ اسلامێ ئەوێن کۆێلە بەری اسلام بهێت،

ل ڤێرێ اسلامێ چکر؟

بەرسڤ:

ئێک اسلامێ دەرگەهێ ئازادیا دادپەروەر بوو کۆێلەیان ڤەکر

**بەرسڤا گومانێت بێ دینییێ**

باشە ئازادیا دادپەروەر چیە؟

بەرسڤ ، ئانکو اسلامێ هەردوو لایەن ل بەرچاڤ وەرگرتن،

لایێ ئێکێ حەزا کۆیلەی ل سەر ب دەستڤەئینانا ئازادیێ

لایێ دووێ،پاراستنا مالێ سەروەرێ وی کۆیلەی چونکە سەروەری کۆیلە بەرامبەر هندەک پارا یێ کڕی،و هندەک پارە ژی ل خۆدانکرنا وی مەزاختیە،

اسلام دینەکێ دادپەروەرە،لەوا گرێبەستا کڕینا ئازادیێ بوو کۆیلەی دانا-کۆ سەروەر و کۆیلە گرێبەستەکێ بنڤێسن،ئانکو ئەگەر کۆیلەی حەزکر ئازاد بیت دێ دگەل سەروەرێ خۆە ل سەر پارەکێ پێک ئێن کو کۆیلە وی بڕێ پاڕا بدەت سەروەرێ خۆە دا ئازادبیت،

خودایێ مەزن دبێژیت:

وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ

سوڕەت ٌ النور ،ئایەتا(٣٣) -یێ،

ئانکۆ ،و کۆلەیێن هەوە ئەوێن دڤێن پێکهاتنەکێ دگەل هەوە بنڤێسن دا ئازا بین،ڤێجا هوین پێکهاتنەکێ ل سەر هندەک مالی دگەل کوێلەیێن خۆە بکەن،وبنڤێسن،ئەگەر هوین ببینن کۆ کۆێلەیێن هەوە دئەمینن و دشێن ڤێ پێکهاتنێ ب جهـ بینن،و ژ مالێ خۆدێ ئەوێ خودێ دایە هەوە بدەنە وان،

ل ڤێرێ پسیارەک هلدکەڤیت ؟؟

باشە ئەڤ کوێلەیە ڤی پاڕەی ژ کیڤە بینیت بوو ئازادکرنا خۆە ،؟؟؟چونکە کەد و کەسپا وی هەمی بوو سەروەرێ وی یە؟؟؟؟؟!!!!

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بەرسڤ، اسلامێ ئەڤ تشتە ژی ل بەر چاڤ وەرگرتیە،

بەرسڤ، پشتی ئیمزاکرنا گرێبەستێ دناڤ بەرا کۆێلەی و سەروەری دا دهێتە کرن، دێ کەد و کەسپا کۆێلەی بوو کوێلەی بیت نەک بوو سەروەری،

بەلکۆ هەتا وی ڕاددەی اسلامێ داخاز ژ کوما موسڵمانا کریە کو هاریکاریا کوێلەی بکەن ل سەر دانا بهایێ ئازادیێ و ئەڤەیە ڕامانا گۆتنا خودایێ مەزن ،دەمێ دبێژیت:

وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ،

سوڕەت نور،ئایەتا ٣٣یێ،

پسیارەکا دی ل ڤێرێ هلدکەڤیت؟؟

چێدبیت سەروەرێ کۆێلەی ب نڤیسینا گرێبەسێ ڕازی نەبیت!!

پا چارەسەری چیە؟؟

## پشکا سیێ،

## کۆێلە،کەنیزەک،(عبید)

بەرسڤ، پشتی ئیمزاکرنا گرێبەستێ دناڤ بەرا کۆێلەی و سەروەری دا دهێتە کرن، کار و کەسپا کۆێلەی دێ بو کۆێلەی بیت نەک بوو سەروەری،

بەلکۆ هەتا وی ڕاددەی اسلامێ داخاز ژ کوما موسڵمانا کریە کو هاریکاریا کوێلەی بکەن ل سەر دانا بهایێ ئازادیێ و ئەڤەیە ڕامانا گۆتنا خودایێ مەزن ،دەمێ دبێژیت:

وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ،

سوڕەت نور،ئایەتا ٣٣یێ،

پسیارەکا دی ل ڤێرێ هلدکەڤیت؟؟چێدبیت سەرەورێ کۆێلەی ب نڤیسینا گرێبەسێ ڕازی نەبیت!!پا چارەسەری چیە؟؟

بەرسڤ:فەرمانا قورئانێ موسڵمانی هانددەت بوو ڕازیبوونا گرێبەستێ و دڤێت مسڵمان نەیێ خۆە پەرست بیت،و دگەل ڤێ چەندێ هەمیێ ژی ئەگەر سەروەر ڕازی نەبیت ب گرێدانا گرێبەستێ دگەل کۆێلەیێ خۆە، هینگێ مافێ کۆێلەی یە کێشا خۆە ببت بەرامبەر دادگەهێ و دێ دادوەر سەروەری نەچارکەت کو ڕازی ببیت،

پسیارەکا دی سەر هەلددەت؟

ئەگەرگرێبەست هاتە ئیمزاکرن و کوێلەی نەشیا پارێ خۆە بدەت وکەسێ ژی هاریکاریا وی نەکر پا کۆێلە چ بکەت؟؟

بەرسڤ،امامێ عەلی خۆدێ ژێ ڕازی بیت،

دبێژیت،ئەگەر کۆێلە نەشیا وی پارەی هەمیێ پەیدابکەت یێ دگرێبەستێ دا هاتیە نڤێسین،

دێ پشکەکێ ئانکو ڕبعەکێ ژ وان پارا دەتە سەروەرێ خۆە و دێ ئێکسەر ئازاد بیت،ئەو سێ چارێکێن پارا یێن ماین دێ ل سەر کۆێلەیێ هاتیە ئازادکرن بیتە دەینەکێ مەدەنی،،هەر دەمێ پێ چێببیت دێ وان پارا دەت،و ئێدی خلاس یێ ئازادە و نازڤڕیتەڤە کۆێلایەتیێ،

هێشتا بەڵگە هەنە،

پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت،

أيما رجل أعتق امرءا مسلما استنقذ الله بكل عضو منه عضوا منه من النار، رواه ،البخاری،

واتە هەر کەسێ کۆێلەیەکێ ئازاکەت خودێ دێ ب هەر ئەندامەکێ کوێلەی ئەندامەکێ وی کەسی ژی ژئاگری ئازاکەت،

و امامێ عومەر خودێ ژێ ڕازی بیت هەمی دەما دگوت ابو بەکر سەرۆەرێ مەبوو و سەروەرێ مە بیلال ژ کۆێلایەتیێ ئازاکر،

و هەروەسا قورئانێ داخازکر کوێلە بهێنە ئازاکرن و سەرەدەریەکا جوان دگەل دا بهێتە کرن،

ڤێجا ئازاکرن کرە ڕێکەک بوو نێزیکبوونا خودێ، خودایێ مەزن دبێژیت،

فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ * فَكُّ رَقَبَةٍ!!، سورەت البلد،ئایەتا ١١ هەتا ١٤ ێ

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

دەرێخستن، ئانکو بوو نمونە تشتەکێ ل زاخو بەرزەکەم و ئەو تشتە ل دهوکێ دەرکەڤیت برێکا بیردوزا کەممی، بەلێ ئەڤە فوتونە و سادەیە، وساناهیە بهێتە ڤەگوهاستن، بەس لەشێ مروڤی یێ موعەقەد چەوا وەسا هاتییە ڤەگوهاستن و بێی تێکبچیت! ئەم وێ نزانین بەلێ نەدیرە ئەم بزانین و ڕوژەك ژ ڕوژان وەکی وێ فوتونێ مروڤ ژی بهێن ڤەگوهاستن.هندەک ژی دبێژن ئەڤ چەندە خەلەتە ! بووچی؟ دبێژن چونکە ب لەزاتیا گەلەک زێدە بارسا تشتی دبیتە هێز ! ،ئەز ژی پرسیار دکەم کا بوو من ب سەلمینن چەوا دبیتە هێز؟؟ چونکە

(ب لەزاتیا گەلەك و گەلەك زێدە بارستا وی تشتی زێدەدبیت نابیتە هێز !! )

## ئینانا ژنبرای پشتی مرنا برای حەلالە یان حەرامە؟

.

هەڤالەکێ ئێزدی پسیار کربو بابەتەکی بنڤیسم کا بوچی ژنبرا حەلالە شی ببرایێ مێرێ خو بکەت پشتی مرنا مێری! .

بەرسڤ:

١- ئەوێ تشتا حەلال دکت و حەرام دکت خودێ یە لەوما ئەو کەسێن باوەر بخودێ نەی نەشین حەتا زەواجێ دگەل مەحارما ژی ب تشتەکێ خەلەت یان حەرام بزانن چنکی لدەف وانا د ئەسل دا حرام و حلال نینە.

٢- لەوما ئەهلێ دیانەتا بتنێ باوەر بحەلال و حەرامی هەیە و خودێ یە دیاردەکت.. لەوما خودێ بتنێ ئەڤ صنفة حەرام کرینە

( سورة النساء، الآية ٢٣:

حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم وأخواتكم وعماتكم وخالاتكم وبنات الأخ وبنات الأخت وأمهاتكم اللاتي أرضعنكم وأخواتكم من الرضاعة وأمهات نسائكم وربائبكم اللاتي في حجوركم من نسائكم اللاتي دخلتم بهن فإن لم تكونوا دخلتم بهن فلا جناح عليكم وحلائل أبنائكم الذين من أصلابكم وأن تجمعوا بين الأختين إلا ما قد سلف إن الله كان غفورا رحيما).

٣- لدەف هەمی ئەدیانێت سەماوی زەواج لگەل ژنا برای حەلالە ئەگەر برا مر و لدەف یەهودیا واجبە ئەگەر برایەک مر و عەیال نەبت ئەو ژنکە شی ببرایی وی بکەت و عەیال دێ لسەر ناڤێ وی ڤرای بت یێ عەیال نەی، لەوما د تەوراتێ دا (سفر التكوين اصحاح ٣٨) هاتیە دەمێ ئێرا کورێ یەهوزایێ کورێ یەعقوبی مری و عەیال نەی ژنکا وی شی ب برایێ وی کر و دەمێ ئەو ژی مری شی بیێ بچیکتر کر.

.

٤- لدەف هەر ئاینەکی شەریعەت برەنگەکی یە لدەف هندەکا هندەک صنف حەرامن و لدەف هندەکیت دیتر حەرامن! لدەف مەسیحیا دوتمام و پسمام لێک حەرامن! ما چێدبت استهزائێ بغەیری خو بکن دەمێ ددیانەتەکێ دیتر دا حەلال ب؟

٥- د ئێزدیاتیی ژی دا بتنێ ئەڤە وەکو عەدەتەکی یە و چ وەحی ژدەف خودێ نە هاتیە بێژتە وانا حەرامە.. لەوما ئەز پسیار دکم دکیژ قەولێ وەدا هاتیە زەواجا دگەک ژنکا برای حەرامە؟

.

## رونكرنەكا بچیک لسەر ڤێ فەرموودێ یا دبێژیت

**الحديث: ٩٣٥٦ - قال رسول الله صلى على وسلم**

**(لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة)**

قال الشيخ الألباني : ( صحيح ) انظر حديث رقم : ٥٢٢٥ في صحيح الجامع

(بيغه مبه ر سلاف لێ بن دبيزيت

ئەو مــلــلەت سەر كەفتی نابیت یێ سەر كردێ وان( ژنک) بیت)

خالا ئێکێ : ئەڤ فەرموودیە بەحسێ موسلمانایە نەک غیر موسلمانا چونكی ل بوارێ سیاسەت و دەولەت داریێ موسلمانا چ پەیوەندی ب كەسێن دی ڤە نینە و هەر بۆ زانین یێ ئەنجێلا مێركلێ دكەتە نموونە بۆ سەرۆكا ولاتی كوو پێشكەفتیە ، تەبعەن هەرچەندە موسلمانا پەیوەدنی ب وێ ڤە نینە بەلێ هین دزانن ئەنجێلا مێركل سەرۆک نیە بەلكوو راوێژكارا ئەلمانیایە و زۆربەیا دەسهەلاتا هەمی ولاتا ئێک تاكە كەس نیە خۆ ئەگەر موسلمان ژی بیت ..

خالا دووێ : ل فەرموودێ نابێژیت ناچێبی بەلكوو دبێژیت سەرناكەڤیت ، ئانكو وەک ئامۆژگاریک بۆ موسلمانا دبێژیت ، ئەم هەمی دزانین كار و بارێ دەولەتێ پێدڤی ب هاتن و چۆن و تێكهەل بوون و كۆبونەڤایە و ئەڤە بۆ ئافرەتێ زەحمەتە گەلەک و ئەڤ نموونە ژی یا ل ولاتێ دەرڤەژی دیار دبیت توو زەحمەت دێ بینی سەرۆكەک ئافرەت بیت بۆ نموونە هەمی ژیانا ئەمریكا سەرۆكەک ئافرەت نەبوویە ! ئەڤە تنێ نموونەک ئەگەر چی موسلمان ژی نینە ..

خالێ سێییێ : ئەڤە تنێ بەحسێ سەرۆكایەتیێ نەک دادوەری و بەرپرسێ هندەک جهێن دی یێ حكومی بۆ نموونە مدیر مستەشفا و مدیر مەدرەسە .....

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

حەتا دوماهیێ و ئەڤ حەدیسە بۆ هندێ بوویە چونکی ئەگەر ئافرەت سەرۆک ولات بیت نابیت عاتیفە بیت و زی بریارا بدەت ئەڤە سروشتێ ئافرەتێیە کوو یا عاتیفەیە و ئافرەتێ زەحمەتە بچیت جیهادێ بکەت و بریارا لسەر شەری بدەت و هێزێ ئامادە بکەت !

ب کورتی ئەڤە کارێ زەلامیە و ئەو دشێت باشتر برێڤە ببەت ژ ئافرەتێ وەکی چەوا ئافرەت ژ هندەک کارا ژ زەلامی زیرەک ترە ئەڤە سروشتێ ژیانێیە ئافرەت و زەلام تەمامکەرێ ئێکدینە.

## کورتیەک ل سەر گوتنا حەوا یا ژ پەراسیا ئادەمی دروستبی

ئەگەر ئەم خواندنەکا مەوزوعی بو قورئانێ بکین دێ باش زانین کۆ ئادەم و حەوا هەردوو یێ ژ ئاخێ هاتین چێکرن و چ راستی بو وێ چەندێ نینه ، حەوا ژ پەراسیا ئادەمیه ، و ژبەر ڤان بەلگەیان

ئێک : خودێ بەحسا چێکرنا مروڤی دکت و دبێژیت (و بدء خلق الانسان من طين ) ئانکو : چێکرنا مروڤان یا ژ ئاخێ دەستپێکری ، لڤێری دیاره خودێ نەگوتیه ئادەم بتنێ یان حەوا ژی استسنا نەکریه .

ئەرێ ما ئەم دشێن بێژین حەوا نه مروڤه ؟

دوو : ئەێن دبێژن (وخلق منها زوجها) ئانکۆ مه حەوا ژ ئادەمی یا چێکری ، براستیژی ئەڤ تەفسیره دویره ژ راستیێ و مەوزوعیەتی ، هەروەکی ئەسبەهانی دبێژیت مەرەم پێ ئەوه خودێ وەکی نەوعێ ئادەمی ژنکەک بو وی چێکر ،

چنکو د ئایەتەکدیدا خودێ دبێژیت (والله جعل لكم من انفسكم ازواجا) ئانکۆ خودێ ژ نەفسێن وه ژنکێن وه بێن داین . ئەرێ ما دروسته بێژین ژنکێن مه یێ ژمه چێبوین ؟؟؟ یانژی وەکی ئەسفەهانی گوتی دروسته کۆ خودێ نەوعێ وەکی مه ژنژی بێن داین ؟؟

چوار : ئەگەر لدیف تەفسیراوان بچین بو (نفس واحدة) دڤێت بێژین ئادەم یێ ژ حەوایێ چێبی چنکو نفس + واحدة بو مؤنث ي یاهاتی ، کەواته (زوجها) ئادەمه . ئانکۆ هکر خوه تەفسیراوان دروستژی بت دڤێت لدیف ڤێ ئایەتێ بێژین ئادەم یێ ژ حەوایێ چێبی .

پێنج :خودێ دبێژيت (ان الانسان خلق هلوعا) ئانكو نێر و مێ ، يان ئايەتەك ديتر دبێژيت (خلق الانسان من عجل ) ئەرێ ما لڤێرێ مەرەم بس نێره ؟ ئادەمە ؟ ئەكيد نەخێر بەلكو بەحس ل ئادەمی و حەوايێ هەروانە .

شەش : زانايێ مەزن احمد عاشور دبێژيت (خلق منها) ئەو (من) براما‌نا (تبعيض) (ژێ) نائێت ، بەلكو عەرەب بكاردئينن بو دياركرنا رەگەزی ئانكۆ : مە رەگەزەك چێكر هەر نەفسی نەوعی .

هەروەكی من گوتی (والله جعل لكم من انفسكم ازواجا)

ئەرێ ما ژكيڤە بەرعاقلە بێژين ژنكێن مە يێ ژمە چێبين .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

**خودایێ مەزن دبێژیت ( وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ )يس٤٠**

**ئانکو هەمی تەن دناڤ گەردونی مەلەڤانیا دکەن**

ئەو کەسێ شارزا بیت ل فیزیایێ دزانیت هەر تەنەکێ ل گەردونیدا مەلەڤانیا بکەت پێدڤی ب ناڤەندەکا ماددی یا هەی ..

بۆ نموونە دەمێ تۆپەکێ فرێددەینە ناڤ ئاڤەکێ ئەڤ تۆپە دێ دەست ب جولێ کەت سەبەبی گەردێ ئاڤێ ..

ب هەمان شێوە جولەیا هەسارە و ئەستێرا پێدڤی ب ناڤەندەکا مادی دبیت حەتا بشێت ئەڤ تەنە دناڤ گەردونی مەلەڤانیا بکەن

ل دیڤ دەستورا نادلنیایی ( نە متەکدی ) هاینزبێرگ نەشێین بۆشاییێ space ب تمامەتی ب بەتال دابنێین ، هەروەکی زانایێ فیزیای ستیڤن هاوکینگ د کتێبا خۆ - The theory of everything - لا/٦٦ } دبێژیت : بۆشایی space نابیت ب تمامی بەتال بیت ، چونکی ئەڤە رامانا وێیە هەمی بوارا ، نموونە بوراێ کێشکرن Gravitational field- ، بــواری کارۆموگناتیسی - Electromagnetic field ، بتەمامی بکەنە سفر

زەحمەتە توو بشێی وێنەکێ بۆشایی دروست بکەی د مێشکێ خۆدا بەلێ دێ شێین ل روویێ فیزیایی هەست پێ بکەین

ئەڤەژی پێکهاتا گەردونیە ل دیڤ زانستێ ئەڤرۆ ب ڤی شێوەی یا دابەش کری

٧٠% ی وزا تاری dark energy

٢٥% ی ژ ماددەێ تاری dark matter

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

٤% ی لژ ماددێ ئاسایی matter

٠,٠٣%ی توخمێ قورس heavy elements

٠,٣%ی نیوترۆن neutrinos

٠,٥% ئەستێرا stars

هەموویێ کۆم بکەین دکەتە ١٠٠%

http://curious.astro.cornell.edu/.../658-what-s-the...

ئانکوو گەردون ١٠٠% یا تژی بووی ب مادده و وزێ ، نوکەژی دێ بێژین ئەرێ نوسەرێ قورئانێ چەوا زانی گەردوون ناڤەندەکا ماددیە و هەمی تەن تێدا مەلەڤانیا دکەن .

## ئاڤێ ڤەخۆت دێ مریتن...

مە گۆت بێدین دوژمنێ ئیسلامێ یە دێ ب درەوا دژایەتیا ئیسلامێ کەت بەلێ خێرە نوکە درەوا ب ناڤێ زانستی ژی دکەت ؟ دگەل مەبن و سەحکەنێ ...

زانایا ئەڤرۆ جۆرەکێ ئاژەلی یێ دیتی کوو ئاڤێ ناڤەخوت ، و سەیرتر ل ڤێ چەندێژی **ئەگەر** ئاڤێ ڤەخۆت دێ مریتن...

خودایێ مەزن د قورئانێ دا دبێژیت ( وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ (٣٠) وهەر تشتەکێ زێندی مە ژ ئاڤێ چێکر، ئەرێ ما ئەڤ کافرە ژ بەر وی تشتێ ئەو دبینن باوەرییێ نائینن، وپەرستنا خودێ ب تنێ ناکەن؟ ..

گومانەک دهێتە کرن دبێژیت یا ئەڤ گیانەوەرە بۆچی ئاڤێ ناڤەخۆت ؟ هەرچەندە ئایەت بەحسێ دروستکرنا گیانەوەرا دکەت نەک دبێژیت ڤەدخۆت یان نە بەلێ لسەر ڤێ چەندێ ژی ئەم دێ چین کا زانست چ دبێژیت بۆ ڤێ مەسەلێ حەتا بێدین فێلبازیێ وانا دیار ببن.

ئەڤ گیانەوەرە ناڤێ وی (الجربووع- جرذ كنغري-الفأر الكنغر )ە،بە ئینگلیزی(Kangaroo rats)ب کوردی دێ شێین بێژینێ (مشکێ کەنگەر)،ئە ڤ مشکە ل بیابانێت نیڤادا لە ئەمریکا دژیتن .

زانایا ئەڤ گیانەوەرە ئینا و بزۆری ئاڤ دایێ و پێ مر ، و نوکە بلا سەحکەینێ کا زانست چ دبێژیت پشتی لێکۆلینەڤا زانایا کری وانا دیت ل ناڤ

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

لەشێ ڤی زیندەوەری کارگەیەک یا هەی بۆ دروستکرنا ئاڤێ ، ئەڤ گیانەوەرە جۆرەکی روەکی دخۆت کوو ل ژینگەهێ وی یێ هەی یێ هشکە و ئێک دلۆپا ئاڤێ ژی تێدانیە وی روەکی ب عەرەبیێ دبێژنێ روەکێ ( حبوب جافە جدا ) پشتی وی روەکی هەرس دکەت ژ لایێ کۆئەنداما هەرسی یا وی گیانەوەری گازا هایدرۆجینی لێ دەردچیت ( H ) .

ئەگەر سەحکەینێ ئەم هەمی دزانین ل زانستی ئاڤ پێکدهێت ل دوو گەردێن هایدرۆجینێ ل کۆئەندامێ هەرسێ و گەردەکێ ئۆکسجینێ ل کۆئەندامێ هەناسێ ، ئەڤ گیانەوەرەژی ئۆکسجینێ وەردگریت ب رێکا کۆئەندامێ هەناسێ و پشتی هنگی ئاڤێ دروست دکەت .

ژێدەر :

http://spacecollective.org/TheJehosephat/2853/Kangaroo-Rats

**ئەرێ پیغمبەری سلاف لیبن مشروب ڤەخاریە ؟**

زور جار دێ بینین یان گولێ بین و بەڵگان بوو مە د ئینن د بێژن پێغەمبەری (س.خ) مەشروبێ فەخواری و بەلێ ئیسلامێ مشروب یێ حەرام کری ، بەلێ بوو مە جەند حەدیسەکا د دانن وەکی بەڵگە ل سەر (شرب النبیذ یان نبذ لە ) و متەکد ئەو حەدیسە هەمی د صحیحن و د راست بەلێ ئەوا درەو و جەواشەکاری ئەوە

خەلک هەمی نزانن فەرق ل ناڤبەرا (خمر و نبیذ) چیە ؟

ئەو حەدیسێن د کەنە بەڵگە ل سەر پێغەمبەری (س.خ) هەمی راستن بەحسی نبیذێ دکەت نەك خمر واتە پێغەمبەری نبیذ یا فەخاری نەك خمر !!

دا بزانین ج چێوازی دناف بەرا نبیذ و خمر داهەیە ؟؟

د زمانێ عەرەبیێ دا ( نبذ ) واتا فرێ دان یان کەڤتنە ناڤ یان ئیهمالکرن . ل وی زەمانی زور ل جیهانێ شەربەت نەبۆ وەکی نوکە ، خەلکی خورمە یان تری یان هەر فێقیەکێ دی د ئینا د کرە د ناف ئافێ دا بوو دوو روژان ژ بەر هندێ تاما ئافێ خوش بیت پاش د خار وێ خارنێ د گوتێ نبیذ ، بەلێ ئەگەر ژ سێ روژان زێدە تر مابا د گووتێ (خمر ) ئەوا حەرام ، هەمی حەدیسە ل سەر نبیذ هاتینە و پێغەمبەری خواریە و چ نبیذ ژ وان بو سێ روژا یان زێدە تر نەماینە . و هەمی دەمان پسیار د کر خارنا نبیذ ج یا خورمێ بیت یان تری . ئەرێ جەند روژان د ئافێ دا یە ؟؟

ئەگەر دوو روژ و نیفا پێ چوبیت فرمان یا کری وێ نبیذێ ب رێژن و نە خواریە ، .....

کی د بێژیت هوسا نینە ب هەر لایەکی بلا بوو مە ب سەلمینیت ( نبیذ ) واتە مەی؟

فەرمون ئەفەمە هەمی فەرهەنگێن عەرەبی ل فی لینگی دا واتا نبیذێ بوو دەربینن بزانین مانا شەربەت د هێت یان مەی ؟

http://www.baheth.info/index.jsp

ئەفە ژی لینکێ وان هەمی حەدیسێن مسلم و بخاری ... هتد حەدیسەکێ بوو مە بینن کو پێغەمبەری س.خ خمر یان مەی فەخاریە یان نبیذ ب رامانا مەی دهێت

http://www.dorar.net/hadith

## دەجال کیە...

دەست پێکێ بێدین باور بکەت ژ دەجالی یان نە ئەڤە تشتەکێ عادیە بەلی یا سەیر ئەوە موسلمان هەبن و باور ژ دەجالی نەکەن لڤێرە دبیتە تشتەکێ سەیر و ب هانەیێت سەیر و سەمەرە بینن ...

ل دەست پێکێ من نەڤێت بچم ناڤ وێ مەسەلێ یامن دڤێت ل ڤێ خالێ بسەلمینین دەجال کیە ...

ئەگەر ئەم سەحکەینە سیفاتێت دەجالی نەفسی سیفات یێ لدەف ابلیسی هەین ، ابلیس مەزنترین فتنەیە و دەجال ژی مەزنترین فتنەیە ، دەجال دشێت بچیتە سەر شێوێ مرۆڤا و خەلکی زیندی بکەت بەلێ نەک ئەو مرۆڤە بەلکوو یێ چووین سەر شێوێ وی ، ابلیس ژی دشێت بچیتە سەر شێوێ وی ، کەس نەشێت دەجالی بکوژیت هەتا عیسا علیە سلام دانەبەزیتە سەر عەردی و ب چەکەکی دێ کوژیت کوو نەلسەر عەردیە ، و ل حەدیسێ دبێژیت دەجال دزانیت کوو عیسا علیە سلام یێ دابەزی ژبەر هندێ رادکەت و نامینیت ل نزیک ، ئەڤەژی ل هێزا مرۆڤا نیە بەلکوو ئەو زانستە یێ ابلیسی هەی ، من نەڤێت درێژ بکەم بەلێ چەندین حەدیس لسەر تایبەتمەندیێ دەجالی هەبن ل دەف ابلیسی ژی ئەو یێ هەین و مرۆڤا ئەو تایبەتمەندی نینە ، بکورتی دەجال شەخسێ ابلیسیە و ابلیس ژی مەزنێ شەیتانایە.

گەلەک جارا ئەڤ پرسیارە دهێتە کرن دبێژن ابلیس نامریت هەتا رۆژا دوماهیێ بەڵێ بەحس ل کوشتنا دەجالی یێ هاتی کرن ؟ بەلگەژی وانا ئەڤ ئایەتەیە

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ[الحجر:٤٠]

دەلیل لسەر ئاخفتنا من

http://quran.ksu.edu.sa/tafseer/tabary/sura7-aya15.html

ل ڤێرە دیاردبی کوو خودایێ مەزن وعد نەدایتێ کوو دێ مینیت هەتا رۆژ دوماهیێ بەلکوو یێ گۆتیێ هەرە چاڤەرێکە

ئەگەر ئەم سەحکەینە ئایەتێ دبێژیت خودێ دێژیتێ هەرە چاڤەرێ بکە ، ئانکۆ خودێی وعد نەدایتێ کوو دێ وی هێلیتە ساخ و متەکد ابلیس ژیدێ مریت وەکی هەمی نەفسێ دی بەلگەژی ئەڤ ئایەتە ( كُلُّ نَفۡسٍ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ (٥٧) هەر نەفسەکا زێندی دێ تام کەتە مرنێ، پاشی هوین بۆ حسێب وجزادانێ بۆ نك مە دێ ئێنە زڤڕاندن. )

و پرسیارەکا دی دهێتە کرن باشە پشتی ابلیسی خەلک دێ تاوانا کەت یان نە ؟ مادەم ئەو مر!

بەرسڤ بۆ ڤێ پرسیارێ وەکی ئەمهەمی دزانین ابلیس تنێ مەزنێ شەیطانایە ئەگەر نە گەلەک شەیطان یێ هەین و یێ جن و انس ژی یێ هەی ب دەلیلا قورئانێ

وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ (١١٢) وکانێ چاوا مە تو ب دوژمنێن تە یێن بوتپەرێس جەڕباندی وەسا مە هەمی پێغەمبەر ب دوژمنێن سەرداچوویێن مللەتێن وان و ب دوژمنێن سەرداچووی ژ ئەجنان

جەڕباندن، هندەك ژ وان وێ گۆتنا ب نەحەقییێ هاتییە خەملاندن بۆ هندەکان دبێژن؛ دا گوهدار پێ بێتە خاپاندن، و ژ ڕێکا خودێ دەرکەڤت. وئەگەر خودایێ تە ڤیابا دا ڕێ د ناڤبەرا وان ووێ دوژمناتییێ دا گرت، بەلێ ئەو جەڕباندنەکە ژ خودێ، ڤێجا تو وان ووان بێ بەختییێن ئەو دکەن بهێلە.

ل ڤێرە دیار بوو کوو ابلیس و دەجال ئێکن ژبەر هندێ پێدڤی رونکرنا زێدەتر ناکەتو هەر موسلمانێ باوری ب هەبوونا ابلیسی نەبیت ئەڤە ئەو یێ انکاریا قورئانێ دکەت و ب موسلمان ناهێتە هەژماردن ژبەر هندێ ئەڤ بابەتە تایبەتە بۆ موسلمانا ، ئانکوو بۆمن گرنگ نیە بێدینەک چ بێژیت چونکی وی باوریب ئیسلامێ نیە دێ چەوا باوری ب ابلیسی هەبیت !

ئەگەرێ دووێ کوو ئەم بێژین ابلیس نیە دڤێت دجال تشتەک بیت کوو حساب دگەل نەهێتە کرن دگەل وی و خودێی خاص بۆ وی کاری دروستکربیت و ئەو نەهێتە محاسبە کرن لسەر وی کاری چونکی بدەستێ وی نەبوویە و بەلگەژی ئەڤ ئایەتە ولا تزروا وزارة وزر اخری

و خالەکادی ئەم هەمی دزانین دابەزینا عیسا علیە سلام د قورئانێ و حدیسا ژی یا هاتی ، ئەگەر مەزانی دابەزینا وی راستە ئەڤە چ شک نامینن بۆ هاتنا دەجالی ژبەر هندێ مە بۆوە ڤی لینکی یا روونکریەڤە دابەزینا عیسا علیە سلام ب دەلیلێت قورئانێ

https://m.facebook.com/story.php?story_fbid=268079853713527&id=223522831502563

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ژبلی قورئانێ مە موسلمانا باوری یا ب فەرموودێ پێغمبەری سلاڤ لێبن هەی کوو راستن و چ گومان تێدا نینە ئەگەر تە بڤێت بزانی حەدیس چیەو چ نیە و ئەرێ بەشەکێ دینیە یان نە دڤێت چەندین لێکۆلینەڤا بکەی هەتا شارزادبی بەلێ من بۆ هەووە وەک ئاسانکاریەک دوو بەش یێ بەرهەڤ کرین لسەر هندێ کا ئەرێ فەرموودە بەشەکێ دینیە یان نە هین دشێن مفای ژێ ببینن

بەشێ ئێکێ :

https://m.facebook.com/story.php?story_fbid=243689689485877&id=223522831502563

بەشێ دووێ :

https://m.facebook.com/story.php?story_fbid=244156226105890&id=223522831502563

بۆ زانین ئەڤە تنێ رەئیا منە و ئەز نوێنەراتیا کەسێ ناکەم ئەگەر یێ خەلەت بم خەلەتیا منە ئەگەر یێ درست بم ئەڤە ژ لایێ خودێ ڤەیە .

## ئەرێ ئەڤ ئایەتە بەحسێ کوردایە ؟

ل ڤان رۆژا ئایەتەک یا بلاڤ بووی دناڤ خەلکی و دزبێژن ئەڤ ئایەتە بەحسێ کوردا دکەت و حەدیسەکێ ژی دئینن دبێژن ئەە پالپشتیا وێ دکەت ، خودایێ مەزن دبێژیت ل سورەتا الفتح ئایەتا ١٦

قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا

ئانکۆ دگەل قەومەکی دێ شەری کەن بهێز و چاڤ نەترسن و هندەک دبێژن ئەو کوردن و ڤێ حەدیسێ دئینن

قالَ اِبْن أَبِي عُمَر وَجَدْت فِي مَكَان آخَر حَدَّثَنَا اِبْن أَبِي خَالِد عَنْ أَبِيهِ قَالَ نَزَلَ عَلَيْنَا أَبُو هُرَيْرَة رَضِيَ اللَّه عَنْهُ فَفَسَّرَ قَوْل رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالهمْ الشَّعَر" قَالَ هُمْ الْبَارِزُونَ يَعْنِي الْأَكْرَاد

ئیبن عومەر ((عبداللە کوڕی عمر )) فەرمووی کە ئەبو هریرەوە لە تەفسیری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم )کە فەرموویەتی ئێوە جەنگ لەگەڵ قەومێکدا ئەکەن کە پێڵاوەکانیان لە توکی ئاژەڵە کانیان دروستکردووە ئەوانە (( البارزون یعنی * الاکراد * )) (کوردەکانن ) واتە لەسەر شاخەکان ئەژین یان بە شاخەکاندا هەڵئەگەڕێن

ئیبن عومەر ئانکۆ عەبداللە کورێ عومەری دبێژیت کوو ابا هورەیرەی د تەفسیرا ڤێ فەرموودا پێغمبەری سلاڤ لێبن کوو یێ گۆتی دگەل قەومەکی دێ شەری کەن و پێلاڤێ وانا ل توکێ ئاژەلا یێ هاتیە دروسکرن ئەو ( الابارزون یعنی الاکراد ) کوردن ، ئانکۆ لسەر چیایا دژین یان ب ناڤ شاخا دگەرێن .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەگەر سەحکەینە دەقێ حەدیسێ پێغمبەر سلاڤێت خودێ لێبن نابێژیت ئەو کوردن بەلکو ابو هورەیرەیە دبێژیت ئەو کوردن ، یێ شارزا بیت دێ زانیت ئەو بەش لێ حەدیس نیە چونکی ئاخفتنا پێغمبەری سلاڤێت خودێ لێبن نیە بەلکوو ابو هورەیرەیە دبێژیت ئەو کوردن .

ل ڤێرە ئەم ئاخفتنا ابوهورەیرەی ب حەدیس ناوەرگرین چونکی ابو هورەیرە کەسکێ سادە بوویە و دبیت تەفسیرا وی یا خلەت بیت و وەکی یێ ڤی سەردەمی ئەوژی موسلمانەک بوویە ، و تشتەکێ دی ئەگەر سەحکەینە مفسرا گەلەکا تەفسیر یا کری ب گەلەک قەومێ دیکە نەک تنێ کوردا و خالەکا ژ هەمیێ گرنگتر ئەوە چ جارا جەیشا ئیسلامێ شەر دگەل کوردا نەکریە ! هەر کەسێ بێژیت شەر یێ دگەل کوردا کری دا بۆمە بینیت مێژوویێ و بێژیت ل ڤێ سالێ بوویە و بێژیتەمە سەرکردێ ئیسلامێ ئەڤە بوو یێ وی شەری و سەرکردێ کوردا ئەڤە بوو و بێژیت چەند کەس هاتن کوشتن و سنورێ کوردا حەتا کیڤە بوو و ل کیش باژێری بوو و چەند سالا شەر بەردەوام بوو نەک ژدەف خۆ تشتی بینیت بێ بەلگە و دبێژین ئەو بەحسێ کلاشایە کوو هەورامی گەلەک لپێ دکەن ، بەلێ ئەم هەمی دزانین کوورد وێ پێلاڤێ بۆ شەری ناکەنێ بەلکوو بۆ سەیرانا وخۆشیا دکەنێ و تنێ جارەکێ دناڤ ئاڤێ بچی دڤێت وێ پێلاڤێ فرێ بدەی ژبەر هندێ بکێل شەری ناهێت نزا ژ کیڤە ئەڤ پێلاڤە ئینا ناڤ ڤێ حەدیسێ .

بۆ زانین ئەڤ حەدیسە بەحسێ تەتەر و مەغۆلا دکەت کوو چاڤێ وانا بچیک بوو و هویر بووینە و وانا گەورەترین ایمپراتۆری یا هەبووی ل بەری نوکە و تەتەر و مەغۆلا مەزنترین شەر یێ دگەل ئیسلامێ کری و چ قەوما وەکی وانا شەر دگەل سوپایێ ئیسلامێ نەکریە.

**کواعب اترابا :**

رەخنە ل ئایەتا ٣٣ێ ژ سورەتا نبأ < وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا > دهێتە گرتن و دبێژن خودێ باسێ سنگێ حۆرییێن بەهەشتێ کریە ! ئەرێ چەوا چێدبیت خۆدێ باسێ سینگ و مەمک و تشتێن هوسا بکەت ؟ !!!!!

بەلێ دڕاستی دا ئەڤ ئایەتە باسێ تەمەنێ حورییێن بەهشتێ دکەت نەک باسێ سینگ و مەمکێن حۆریا !

< وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا > ژی مەبەست ژێ ئەوە کۆ حۆرییێن بەهەشتێ هەمی دئێک تەمەنی دانە و ژ نوی سینگێ وان ب سەرکەتیە ئانکو ژیێ وان د وێ قوناغێ دایە و ئەڤ تشتە دناڤ کۆردەوارییێ ژی دا هەبوویە و هەیە بوو نمونە دبێژن کچا فلان کەسی سینگ و بەرسینگێن وێ گەشە بووینە واتە ئەو کچە یا مەزن بووی نەکو مەبەست ژێ ئەو بیت کو باسێ سینگێ کچێ بکەت و وەکو وێنە بهێتە پێش چاڤێن ڤە،و گەلەک ژ مە ئەڤ چەندە گۆهلێ بوویە و ل دەڤ مە شەرم نەبوویە ئەرێ نزانم بووچی نوکە شەرم بیت؟!،و ئەڤ تشتە دناڤ عەرەبا ژی دا هەیە دەمێ کچەک بالغ دبیت پێدگەهیت دبێژنێ (کاعب).

و بوو پتر ڕونکرنێ ابن عاشور د تەفسیرا التحریر والتنویر لاپەڕێ ٤٤ ێ دا باسێ ڤێ چەندێ دکەت و دبێژیت (کاعب)تاکە، و کویا وێ (کواعب)ە و دناڤ عەرەبا دا دبێژن ۆێ کچێ کاعب ئەوا ژیێ وێ گەهشتیە ١٥سالآ و

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

مەبەست ژ ڤی تەمەنی بالغ بوونە و (اترابا) ژی مەبەست ژێ ئەوە کو هەمی حۆرییێن بەهەشتێ دئێک تەمەنی دانە و ژییێ وان تەمەت ئێکە.

ب کورتی مەبەستا ئایەتێ تەمەنێ حۆریانە نەک سینگ و مەمکێن حوریێن بەهەشتێ !،

ئەڤە ژی ژێدەرێ تەفسیرێ

پەرتوک

:

http://library.islamweb.net/newlibrary/display_book.php?idfrom=4426&idto=4426&bk_no=61&ID=4505

**خودێ و مەلائیکەت نڤێژێ لسەر پێغمبەری دکەن !**

ئەگەر ( صلات ) نڤێژ بیت ، دبیت یصلون عل النبی !

ئانکۆ خودێ و مەلائیکەت نڤێژێ لسەر پێغمبەری دکەن ؟

دەست پێکێ بلا بزانین پێناسا صلاة چیە پشتی هنگی سەحکەینە پەیڤا صلاة ژ لایێ زمانەڤانی کوو ب رامانا نزا و پارانەڤە دهێت ، هەر ژبەر هندێ نڤێژ ژی ب صلاة یا هاتی چونکی هەمی دوعا و پارانەڤەیە ژ خودێی

بلا سەحکەینێ ( ان الله وملائکته یصلون علی النبی ؟ یا ایها الذین امنوا صلو علیه وسلم تسلیما ... الاحزاب ٥٦.

ئەرێ ب رامانا هندێ دهێت کوو خودێ و مەلائیکەت نڤێژێ لسەر پێغمبەری دکەن ؟ تەبعەن نەخێر ، چونکی صلاة ژ لایێ خودێی ڤە ب رامانا مەتح کرنێ لنک مەلائێکەتا دهێت و ژ لایێ مەلائێکەتاژی ڤە پەیڤا صلاة ب رامانا لێخۆشبوونێ بۆ پێغمبەری ..

ئەگەر ب رامانا نڤێژکرنێ بهێت بۆچی خودێ ل ڤێ ئایەتێ دبێژیت ( ئەحزاب ئایەتا (٤٣ ( هو الذي یصلي علیکم )و ملائکته لیخرجکم من الضلمات الی النور

ئەرێ خودێ و مەلائیکەت نڤێژێ لسەر مە دکەن ؟ تەبعەن نەخێر بەلکوو ، برامانا هندێ دهێت کوو خودایێ مەزن ئەو خودایەیە کوو رەحمەتێ دبارینیت بسەرمە و مەلائیکەت ژی داخازا لێخۆشبونێ بۆمە دکەن هەتا ژ تاریکاتیێ بهێینە ناڤ رۆناهیێ .

## خودایێ مەزن بۆچی ئەز دروستکریمە ؟

## ئەرێ وی پرس بمن کربوو ؟

ب کورتی ب چەند خالەکا دێ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دەم

یێکەم : مرۆڤی بخۆ ئەڤ جیهانە یا هەلبژاردی و یێ رازی بووی ب ڤێ ژیانی و ڤێ تاقیکرنێ هەروەکێ خودایێ مەزن دبێژیت (إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا)الاحزاب:٧٢

هەروەسا دبێژیت (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ۛ أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ)

[سورة الأعراف ١٧٢]

ئەگەر توو بێژی بۆچی بیرامن ناهێت ؟ دێ بێژین ئەم هەمی دزانین زاکیرا مرۆڤی ژبیرکرن یا تێدا و تشت مسح دبیت ، دگەل هندێ ژی ئەگەر ئەو تشت هاتبا هزرامە ئەرێ هنگی ئیمانێ چ گرنگی دا هەبیت ؟ باشە ئەم رازینە مە ئەڤ تاقیکرنە یا هەلبژاردی بەلێ بۆچی خودێی ئەم داین مرۆڤ ؟ ئەز دێ بێژم خودێی یا کەرەم یا دگەل مرۆڤا کری هەروەکی دبێژیت : وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ، ئەگەر تە نەڤێت مرۆڤ بی تە دڤیا چبی ؟ چ جۆرێ گیانەوەرا بی ؟ بەرسڤ بلا بۆ وەبیت.

خالەکا دی کوو خودێی مەبەست پێ ئەم دروست کرینە ئەوە کوو خودایێ مەزن دڤیا مەزناتی و بهێزیا خۆ نیشا مە بدەت ، گەلەک جارا ئێک دێ بێژیت ئەز یێ بهێزم و هوسامە بەلێ هەتا تاقیکردنەکێ نەکەت کەس پشت

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

راست نابیت ژێ ، هین سەحکەن ڤی گەردونێ و ڤان هەمی موعجیزا بۆمە دیار دبیت خودایێ مەزن چ شیان یێ هەین !

خالەکادی کوو مرۆڤ ژدەست هەژاریێ بێزار دبیت و ئەڤ پرسیارە دهێتە هزرا مرۆڤی بەلێ خودایێ مەزن رێک یا دایەمە هەمی جیهانێ بگەرێین هەروەکی دبێژیت : قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ۚ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، تێبینی تنێ هنگی جایز نیە ئەگەر خیلافەتا ئیسلامێ هەبیت و دژی کوفرێ شەر بهێت کرن هنگی نابیت بچیە وەلاتێ وانا و ژمارەیا وان زێدە بکەی چونکی هنکی دێ مەترسی بۆ ژیاناتە دروست بیتن .

دگەل ڤێ چەندێ دا مرۆڤ یێ دناڤ تاقیکردنێ ، ئەڤ تاقیکردنە ژی بۆ مرۆڤی عیبادەت دهێتە هژمارتن ئەگەر کریارێ باش بکەت و بۆ هەتا هەتا دێ دناڤ بەهەشتێ مینیت ئەگەر کریارێ باش بکەت ، و دگەل هندێ ژی ئەگەر تنێ شرکی نەکەی خودێ دێ ل هەمی کریارێ دی یێ مرۆڤی خۆش بیتن ، ئەگەرتە تەوبەکر و ئەگەرتە نەکر ژی دێ سزایێ خۆی پاشی دێ چیە ناڤ بەهەشتەکا هەتا هەتایی ، ژبەر هندێ بلا ئەم ڤێ جیهانێ بکەینە دەلیڤە بۆ دست ڤە ئینانا بەهەشتەکا هەتا هەتایی .

**ئەرێ ئیسلام ب رێکا شیری بەلاڤ بویە؟**

ئەڤە پرسیارا کەسێن نەزانە، نە چ ژ دینی دزانن و نە چ ژ مێژوویێ، بتنێ گوت گوتکێن تورێن میدیایی دبینن و د ئاخڤن..

-بکورتی بەرسڤ و چەند نموونە :

پەیڤا ئیسلام یا ژ رەگێ (سلم) هاتی ئانکو ئاشتی و رامانا ملکەچییێ ددەت بو خودێ . ئانکو ئیسلام دینێ ئاشتیێ یە ژ ناڤی دیارە بەلێ دڤێت ل دەسپێکێ ملکەچییێ خودێ بی دڤێت هندەک جارا هێز هەبیت

بو نموونە ....

کەسەک هاتە شەرێ تە تو هێزێ بکارنائینی ؟!!

کەسەک یێ زولمێ و تەعدایێ ل خەلکی دکەت و تە هێز یا هەی تو هێزا خو بکارنائینی بو نەهێلانا زولمێ و دانا ئاشتیێ بو تەڤایا خەلکی...؟

رامانا وێ درستە هێز بهێتە بکارئینان هەکە ئەنجامێ هێزێ ئاشتی و ئێمناهی بیت

١- ئیسلام و مێژوو

ئیسلام و هندستان.....

هندستانێ نێزیکی ٨٠ % نە مسلمانن

موسلمانا نێزیکی هزار سالا فەرمانرەوایيا هندستانێ یا کری ئەگەر ڤیابایە دا هەمیا ب شیری کەنە مسلمان .بەلێ خودێ یا گوتی ((لا اکراه فی الدین)) . تا

نوکە ژیک ئـــەو ٨٠% یێن نە مسلمان شەهدەییێ ددەن ب باشیا موسلمانان دگەل وان و کو ئیسلامێ شیر بکارنەئینایە چ جارا دژی نە مسلمانا

٢- ئەندنوسیا و مالیزیا

ئەندنوسیا باژێرەکە مەزنترین رێژا موسلمانان یا تێدا ل سەرانسەری جیهانێ . و مالیزیا پرانیا خەلکێ وێ مسلمانن...

لڤێرێ پسیارەکێ کیش لەشکەرێ ئیسلامێ چویە شەرێ وان تا بوینە موسلمان؟؟؟

بەرسڤ چ لەشکەر نە چوینە !!!!

٣-کەنارێن روژهەلاتا ئەفریقیا..

هەر ب وی رەنگی ئاینێ ئیسلامێ بەلاڤبونەکا بلەز هەبویە د کەنارێن روژهەلاتا ئەفریقیا

پسیارەکادی هەکە ئیسلام ب شیری بەلاڤەبویە کیش لەشکەر چویە کەنارێ روژهەلاتا ئەفریقیا ؟؟؟

٤- (١٤)ملیون عەرەب مسحیێن (قیبطین)ێ نە:

موسلمانا (١٤)سەدەیا فەرمانرەواییا عەرەبستانێ یا کری و هەتانوکە ژیک (١٤) ملیون مسیحین (قیبطین)ێ ئانکو د بنەرەتێ خودا مەسیحی بوون . هەکە موسلمانا شیر بکار ئینابا نوکە دا هەمی مسلمان بن ....جارەکا دی دێ بێژین(لا اکراه فی الدین))

## ئەرێ راستە مافێ کەسەکی کێمترە ژ یێ موسلمانا دناڤ وەلاتێ موسلمان یان نە ؟

دەست پێکێ من بەحسێ نوکە نینە ئەز دێ بەحسێ خیلافەتا ئیسلامی کەم نەکُ ئەو سەرکردێ نوکە یێ فاشل کوو نۆکەرێ وەلاتێ دینە و دیرن ژ حوکمێ خودێی ، ئەگەر ئەم بزڤرین سەردەمێ خیلافەتێ دێ بینین عەکسە مافێ غیر موسلمانا یێ هاتی پاراستن پتر ژ موسلمانا ، بۆ نموونە موسلمانا جیهاد یا لسەر کوو بکەن و بچن بجەنگ بۆ نەهێشتنا زولمێ و بەرگری کرن ژ سنورێ وەلاتێ خۆ ، بەلێ کەسەکێ غیر موسلمان لسەر نینە بچیت جیهادێ بکەت و دشێت ل مالاخۆ بیت بێی چ شەرا بکەت ..

ل ئیسلامێ موسلمان دڤێت زەکاتی بدەت و فیدیا بدەت یێ سالانا ، بەلێ کەسێ غیر موسلمان بۆ نینە زەکات و فیدیا بدەت تنێ دێ برە پارەکێ کێم دەت کوو دبێژنێ سەرانە کوو چەندین جارا ژ زەکاتی کێمترە هەرچەندە موسلمان سالانە فیدیا رۆژیا ژی ددەت ، ئەو برە پارێ کێم ژی کوو غیر موسلمان ددەت ژبەر هندێیە کوو سەر و مالێ وی دهێت پاراستن و پارێزگاری ژێ دهێت کرن ، ئەگەر موسلمان نەشیان پارێزگاریێ ژێ بکەن دڤێت پارەی ژێ وەرنەگرن ، بەلێ دڤێت موسلمان هەر زەکات و فیدیێ خۆ هەر بدەت ، چونکی فەرزە لسەر وی ، و خالەکادی ژی ئەوە کوو دەمێ ئەو کەسێ غیر موسلمان دان عەمر دبیت دڤێت برە پارەیەک ژ بیت المالا موسلمانا بۆ بهێت دابین کرن دا بشێت ژیانا خۆ پێ برێڤە دبەت ، و ل خیلافەتا ئیسلامێ دا کەسێ بۆ نینە استهزا و دەست درێژیێ بکەت سەر جهێ پیرۆزێت وانا و

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

زۆریێ ژێ بکەتن ، هەمی غیر موسلمانا ژی یا بۆهەی کا چ دکەن و چ نەکەن تنێ سنورێ موسلمانا نەبەزینن وەکی چەوا موسلمان نابیت سنورێ وانا ببەزینن.

هین بخۆ بریار بدەن ل وەلاتێ موسلمانا کوو خیلافەتا ئیسلامی لێ بیتن مافێ کێ زێدەتر و کێمترە ؟

**ماددەم شەیتان رەمەزانێ یێ گرێدایە بووج خەلک تاوانا دکەن ؟**

دژە ئیسلام د بێژن پێغەمبەرێ ئیسلامێ د بێژیت د هەیفا رەمەزانێ دا شەیتان یێ گرێدایە ، ارێ بووجی زور ژ مروفان هەر تاوانان ئەنجام ددەن ؟ !!!

بەرسف :-

دژە ئیسلام ژ بەر نە ژەرەزایێ د قورئان و سونەتێ دا ڤان پسیارا دکەن ، ئەگەر کەسەکێ شەرەزا بیت د قورئان و سونەتێ دا ڤان پسیاران ناکەت و بخوە ناکەتە گومان ، دزانن بووج ؟

جونکە:-

یا ئێکێ : شەیتان سیفەتە ، ئانکو هەر جنەک یان مروفەک کارو کریارێن خراب بکەت و خوو دیرکەت ژ دینێ خودێ ، ئەم د شێین فی نافی ب دەینێ (شەیتان ) .

دوو :-

تنێ ئێک شەیتان نینە بەلکو گەلەک شەیتانێن جن و مروفان هەنە .

ئاشکەرایە کا جەوا :-

ئەوێ ژ فەرمانا خودێ دەرکەتی "ئبلیس " بوو نافێ وی یێ درست " عەزازیل " بوو بەری دەرکەتنا ژ بهشتێ ، بەلێ ب ئەگەرێ بێ فەرمانیا خودێ سیفەتێ شەیتان وەرگرت .

کەواتە دفێت ژ بیرا مە نەجیت :-

(1)شەیتان دوو جورن ، هەم یێن جن و یێن مروڤ ، (الإنسي والانسي) هەر وەکی خودێ د بێژیت (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ) الأنعام، ١١٢.

(2) ئەگەرێن ئەنجامدانا تاواناج تنی بریتی نینە ژ شەیتانان ، بەلکو ئەفە نەفسا مروفی یە کو ب یا شەتانی دکەت بو وێ یەکێ تاوانێ بکەت ، هەر وەکی خودێ د بێژیت

(وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ) یوسف، ٥٣.

(3)ئەگەرەکێ دی یێ ئەنجام دانا تاوانان شەیتانێن کومەلگەهێ نە ، کو تمام بابەتێن نفیسی و دیار و گوهدان یێن تورێن کومەلایەتی و میدیا و دەزگەهێن

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

راگەهاندنێ د فەدگوهێزن ، د فێرێ دا نەک وەک شەیتان کار دکەن ، بەلکو د هندەک باران دا شەیتان ژی یێ سەرسام کری و سەرسام دکەن ب کاروکریارێن دژە دین دژە بها و قیمەت و رەسەنێن بەنی ئادەمێ خودان فیترەت

دوماهیک تشت :

خودێ دڤێت بوو مروفان دیار بکەت د ڤێ هەیڤێ دا کو ئایا شەیتان بوویە ئەگەرێ زور گونەهان یان نەفسێن وان ب خو د خرابن

بوو هەرکەسەکی ئاستێ تاوانێن وان دێ بوو دەرکەڤیت د ڤێ هەیڤێ دا

**ئەرێ هارون برایێ مەریەمێ یە ؟**

بووچی خودێ د قورئێ دا دبێژیت {یا أخت هارون} و نابێژیت {یا اخت موسی}؟

ئەرێ ئەڤ هارونێ د ئایەتێ دا هاتی ، هارونێ کرێ عومرانە ؟

بوو بەرسف دانا ڤێ گومانێ ب جەند شێوەکا دێ بەرسف دەین :-

دقورئانا پیروز دا بڤی شێوازی هاتیە {يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا} (مريم:٢٨)

دەستەیەک ژ مولحدێن خومالی ڤێ د کەنە گومان و دبێژن دڤێت گووتبا (یا اخت موسی ) .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بەرێزان ئەگەر بهێین ب کورتی رەدا فێ گومانێ بدەین .

خودایێ مەزن ل سه ر زمانێ قەومێ مەریەمێ فێ سوعەبتێ بوو مه فەدگەریت وەکی د ئایەتا پێشتر دا گووتی ، (.....فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً.....)

واته :- فێجا پاشی [مەریەمێ ] بجوکێ خو هلگرت ، ئینا دەف مروڤێن خوو [مللەتێ وێ بەرسینگێ وێ گرت ] و گووتن ، هەی مریەم ب سیند ته تشتەکێ زێده خراب و نەبوی یێ کری .

کەواته یەهودییێن قەومێ مەریەمێ هەر ج مەبەست بیت ژ فی هارونی خودایێ مەزن نەقلی گووتنێن وان یێن کرین .

ئەوێ پیجەک شارازای د قورئانێ دا هەبیت دێ زانیت قورئان جیروکێن قەومان ل سەر زمانێ وان دبێژیت ، یان هندەک رودان هەنه جەوا هاتینه بەحس کرن قورئانێ ژی هوسا ین نەقل کرین . ل فێرێ جەند نمونەکا دێ دانم

{ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ } (الأحقاف:٣٠)

د فێ ئایەتێ دا قورئانێ گووتنێ ئەجنان (جن ) یێن نەقل کرین .

یان د بێژیت {حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا} مەبەت ژ فێ ئایەتێ ئەوە (ذو القرنين ) بخو و دەمێ گەهشتینه ناوچا روژ ئاڤا هوسا د زانی روژ د کومەکا تەقنێ دا ( قورێ ) ئاڤا دبیت

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

هەر وەکی مەگووتی خودایێ مەزن ل سەر بیروباوەرێن وان دبێژیت . نەک خودێ د بێژیت روژ ب کومەکا تەقنێ دا ئافا دبیت ..... دبێژت [وجدها] نابێژیت [ اوجدها ] ....

د فێ ئایەتێ دا بەحسی مەریەم و هارونی دکەت ، ئەگەر بەرێ خوو بدەینە سیاقێ ئایەتێ خودایێ مەزن نەقلێ قەولێ یەهودیان دکەت ، { فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ ۖ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا (٢٨) فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا } (مريم:٢٧-٢٩)

دەمێ خودێ دبێژیت ( یا اخت هارون ) ئەفە ڤەگەرانا وی قەولیە یێ قەومێ مەریەمێ ب مەریەمێ گووتی ، سەلماندنا نافی و نازنافی ب وێ واتی نینە کو خوشک و برایێن ئێک بن ، بەلێ زانینا فی هوکاری کو قەومێ مەریەمێ ب مەریەمێ گووتی ( یا اخت هارون ) ئەفە تشتەکێ دیە دفێت بجینە دەقێن قورئانێ و رونکرنەکێ ل سەر بدەین :-

قورئانا پیروزبەحسی هندێ نە کریە کو مریەم خوشکا هارونی و موسایێ کۆرێ عیمرانە . قەومێ مەریەمێ لومەی دکرن ژ بەر وێ جەندێ قەومێ مەریەمێ هوسا هزر دکر کو مەریەمێ بـزنا کور یێ بووی ، ......

بووچ یەهودیان گووت (یا اخت هارون ) بەلێ نە گووت ( یا اخت موسی و هارون ) یان ( یا اخت موسی )؟

بێ گومان یەهودیان ژ دەف خوو ئەف تشتە نە گویتیە کو نافێ مەریەمێ ب هارونی فە کری ، ژ بەر هندێ هوسا گووت  کو هزرا وان هارون یێ بێ

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

شەرم حەیایە ، دەمێ کەرەک (عجلا ) بوو دروستکر وکرە خودێ و خودا پەرستی بوو دکر ، ژ بەر هندێ یەهودیا دگوت ئەی خوشکا هارونی ، مەبەست ئەوە کو مەریەمێ ژی کارەکێ نە دروست یێ ئەنجام دای ، ژ بەر هندێ کو دفیا ترانان گالتەیان پێ بکەن گووت یا اخت هارون ، واتە ئەی مەریەم تە ژی وەک هارونی کارەکێ نە رەوا و کرێت یێ ئەنجام دای .....

زانا د فێ یەکێ دا دوو ریوایەتان دبێژن .

ابن کثیر دبێژیت :- (یا اخت هارون ) واتە ئەی شەبیهێ هارونی د عیبادەتی دا ، بابێ تە زەلامەکێ خراب نە بوو و دەیک ژی دەهمەن پیس نەبوو ، بووج تە کارێ هوسا کریە ؟ واتە تو مەریەم ژ بنەمالەکا پاک و پاقژی و ب نافودەنگی ، جەوا تشتێ هوسا ژ تە جێدبیت ؟

عەلیێ کوورێ ئەبی تەلحە دبێژیت :- یا اخت هارون واتە ئەی خوشکا موسای ژ بەر هندێ مەریەم نە ئەسلێ موسا یە کا جەوا د گووتە ( تەمیمی ) [یا اخا تمیم ]

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

## ئەم راستین یان بێدین ژلایێ زانستی ڤە؟

بێدین زێدە بەحسێ زاانستی دکەن و هوسا هزردکەن زانست جهێ خودێی یێ گرتی بێ ئاگەهـ ژ وێ هندێ کوو هەر زانستە دسەلمینیت کوو خودایەک یێ هەی خودانێ ڤی گەردونی ... بۆ نموونە خودایێ مەزن دبێژیت قل هو الله احد ، ئانکۆ ئەی پێغمبەر بێژە خودێ ئێکە، الله الصمد ئانکۆ خودا یێ بێ کێم و کاسیە ، لم یلد ولم یولد ، ئانکۆ کەس ژ وی نەبوویە و ژ کەس نەبوویە، ئانکۆ چ دەست پێک نینە ... ل ڤێرە دیار دبیت کوو خودایێ مەزن چ دەست پێک نینە و بۆ نموونە ئەگەر ل جهەکی گۆتبا دەست پێکەک یا هەی هنگی دا خەلەت بیت ئەڤ پێناسە ! بۆچی ؟ چونکی ل زانستیدا هەر تشتەکێ دەست پێک هەبیت هۆکارەک یێ هەی، ژبیرنەکە لدیڤ یاسایێ زانستی هەر تشتەکی دەست پێکەک هەبیت هۆکارەک یێ هەی ! ێ خودێی دەست پێکەک هەبا دڤیابا هۆکارەک هەبا بۆ دروست بوونا وی مانە ؟ ێ ئەگەر هۆکارەک هەبا دڤیابا کەسەکی ئەو دروست کربا ... بۆ یێ دیژی هوسا ئانکۆ دوماهیک نەدبوو هەر ئێکی دا هۆکارەک هەبا بەلێ خودایێ مەزن چ دەست پێک نینە ژبەر هندێ ژکەس نەبوویە ..

ڤێ جارێ بزڤرین گەردوونی هەر لسەر وێ یاسایا زانستی ئەرێ گەردونی دەست پێک هەیە ؟ تەبعەن بەلێ ب دەلیلێت ئاینی و زانستی کوو یێ ئاینی مشەنە ئەم لێرە بەحسێ زانستی دکەین کوو وەکی دیار ژ وێنا یێ من داناى چار بەلگێ حاشا هەلنەگرن کوو گەردونی دەست پێک یا هەی .. ێ مادەم دەست پێک هەبیت دڤێت هۆکارهەبیت باشە بۆ هەمی بێدینا ئەو هۆکار چیە لدەڤ هەوە ؟ ئەم دبێژین ئەو هۆکار خودێیە و هین دبێژن چ تشتە ؟

## ژیێ دایکا مە خاتوو عائیشایێ دناڤبەرا راستی و درەوان :

ئەم دبینین هندەک بێدین ڤی بابەتی بەحس بکەی بێی کوو بزڤرن وی سەردەمی و بزانن بارودۆخ یێ چەوابوو ...

بەرێزان ئەم بەحسێ کیش سەردەمی بکەین دڤێت بزڤرین وی سەردەمی کانێ چەوابوویە نەک ب هزر و بیریێن ڤی سەردەمی بەحسێ رودانێ بکەین، چونکی ئەو رودان بەری ١٤٠٠ سالان بوویە ...

شوبها بێدینان ئەوە چەوا کەسەک دێ کچەکێ ل ژیێ حەفت سالیێ مارەکەتن و ل ژیێ نۆ سالیێ دێ ئینیت ؟

بۆ بەرسڤا ڤێ شوبهێ دەست پێکێ وەکی مە گۆتی دڤێت ب زڤرین وی سەردەمی نەک ب هزرا نوکە چونکی ئەگەر پرسیار ژمن بهێت کرن ئەرێ دێ خوشکا خۆ یا نۆ سالی دەیە شی دێ بێژم بێ عاقلیە بەلێ ئەگەر بزڤرین مێژوویێ و بزڤرین بەری نوکە دبیت هنگی بدەینە شی چەوا ؟ چونکی بۆ شوو کرنێ یا بەرهەڤ نینە و بالغ نەبوویە بەلێ ئەگەر بزڤرین پێش سی سالا و نوکەژی مە نموونە یێ هەین ژ یازدە سالیێ یێ شی کری و چ مشکیلە دگەل هەڤژینێ خۆ نینە بەلێ نوکە یازدە سالی ژی تەقریبەن بالغ نابن ایلای ب رێژەکا کێم...

خالەک دی ل ئیسلامێ دا هەرچەندە دوو رەئیێ جیاواز یێ هەین و اختیلاف یا تێدا کا چەند سال بوویە و هندەک دبێژن ژبەر هەبوونا هشام بن عروە ئەڤ حەدیس ناهێنە وەرگرتن چونکی ئەو تووشی نەخۆشیا ژبیرچونەڤێ ببوو، بەلێ گریمان نۆ سال بوو ؟

ئەگەر ژییێ خاتوو عائیشایێ ژی نۆ سال بیتن مە چ اشکال دگەل نینە چونکی ئەو چەند سال ژی بووبیت یا بەرهەڤ بوویە ئەگەرنە بەری پێغمبەر سلاڤ لێبن بخازیت ب دوو سالان کەسەکێ دی خاستبوو بەلێ ل دوماهییێ رێک نەکەتن ژبەر چەند ئەگەرەکا ( من نەڤێت بابەت درێژبیت یێ دەلیلەک ژوان ڤیا دێ بۆ دانێم ) پرسیار ئەوە ئەرێ ئەگەر بەری دوو چار سالا یا بەرهەڤ بیت بۆ خاستنێ بۆچی پشتی چوار سالا کێشەیە ؟ دوو سال پشتی وێ مارە کر و دوو سال هەتا بری ئەڤە بوون چار سال .

پرسیارەک دی ئەرێ بۆچی ئێک دوژمنێ پێغمبەری سلاڤ لێبن گلەی ژ ڤێ خاستنێ نەکر ونەگۆتێ محمد توو یێ زارۆکا دخازی ئەڤە ژ کیڤە کارەکێ درستە ؟ هین دزانن ئەو شەڤ و رۆژ لدیڤ خالەکێ بین بەس ل پێغمبەری بگرن ئەرێ بۆچی رۆژەکێ ژ رۆژان رەخنە ل ڤێ خاستنێ نەگرتیە ؟ ئەگەر تشتەکێ خەلەت بووبیتن ؟ ل وێ چەندێ خرابتر ژی د ماوێ سێزدە چەرخێ بووری کەسێ رەخنە ژ ڤێ نەگرتیە تنێ ل ڤان سالێ بوری، چونکی ب عەقلێ نوکە ئەم هزر د وێ مەسەلێ دکەین بێی بزڤرین هنگی و واقعێ هنگی .

خالەکادی کوو ئەرێ کی نابێژیت خاتوو عائیشا ژی تایبەت یا هاتی دروست کرن و خودایێ مەزن نەفسی مریەمایێ سلاڤ لێبن جیاواز یا دروست کری و یا بەرهەڤ کری بۆ کارەکێ مەزن چونکی ئەم دزانین خاتوو عائیشە ئێک بوو ژ مەزنترین بانگخوازا و زۆربەیا دینی وێ یا بلاڤ کری ژناڤ ئافرەتا و چەندین حەدیس ژی وێ یێ ڤەگێراین .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

خالەکادی ئەرێ بۆچی ئەم ژ لایەنێ باشییێ سەحناکەین ڤێ هەڤژینییێ و هەڤە بپرسین ئەرێ د هەمی ژیانا واندا ئێک نەخۆشی رودایە دناڤبەرا واندا یان هەردەم پێکڤە کەیف خۆش بووینە ؟ ئەرێ ئەڤ پرۆسەیە نابیت پرۆسەکا سەرکەفتی دناڤبەرا هەردوو لایەناندا ؟

خالەکادی دبیت و ئەز بخۆژی وێ احتیمالێ دکەم هنگی کچ مارە کربان و بربان دەفخۆ نە بۆ کارێ جنسی بەلکۆ بۆ هندێ پەروەردە کربانە بەلێ دابنە وان کەسا یێ ژێ پشت راست کوو دێ پەروەردەکا باش کەن و پشتی هنگی هەتا بالغ دبیت ب تەمامی هنگی ئەگەر کچ رازی ببا بۆ کارێ جنسی وەک ژن و مێر دگەل ئێک بن، چونکی ب دەلیلێ قورئانێ نابیت هەتا بالغ نەبیت . ئەرێ محمد سلاڤ لێبن دێ کارەکی کەت دژی قورئانێ ؟ یانژی محمد سلاڤ لێبن قوتابخانە بوو و خاتوو عائیشا ب تەمامی بەرهەڤ کر بۆ خزمەتا ڤی دینی و ئەگەر ئەم سەحکەینێ دێ باش زانین خاتوو عائیشایێ چ رۆلەکێ مەزن یێ هەبووی بۆ گەهاندنا ڤی دینی و بلاڤ کرنا وێ، ئەم دزانین زەلاما پێغمبەر سلاڤ لێبن هەبوو بۆ هندێ دینی ب دروستی فێربن ئەرێ مافێ ئافرەتاژی نینە کەسەک هەبیت ئاینی لێ فێربن ؟ ئەرێ ژ خاتوو عائیشایێ باشتر هەنە کوو وسا باش بهێت پەروەردە کرن ؟

یێ دبێژن پێغمبەری سلاڤ لێبن ژبەر هندێ هندە خێزان ئینان و هەر ژبەر شەهوەتێ یە من پێ خۆشە بەرسڤا ڤێ چەندێ ژی بدەم هەرچەندە ئەڤ مەقتعە بەری نوکە من بەرسڤ دابوو و بەلێ دێ دوبارە ربط کەین دگەل ڤێ شوبهێ و پاشی هیڤیدارم بێدین بۆمە بێژن بنەمایێ اخلاقی و سنور لدەف وە چنە و هەرە ناڤ بێدینا بگەرێ توو کچەکا ١٧ سالی نابینی کچانیا خۆ ژدەست نەدابیت بگرە ژ وی تەمەنی ژی کێمتر هەمیا کچینیا خۆ یا ژدەست دای .. ئەرێ ئەم شەهوەت بازین یان هین ئەسلەن وە چ سنور نینە ...

بلا بچین سەر وێ پرسیارێ بۆچی ئەو ژمارە ئینانیە ...

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

بلا دەست پێکێ بزانین ئەرێ بۆ شەهوەتێ بوویە یان ئەگەرەکێ دی بوویە کوو ئەڤ ژمارە هەڤژینا بینیتن.

خوادایێ مەزن دبێژیتن : لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗوَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا (٥٢)

لەمەودوا هێنانی ئافرەتانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نیە، یان واز هێنان لە هەندێکیان، تا هاوسەرانی تر بخەیتە جێیان، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی دەتەوێ بیانخیتە جێگەی هاوسەرانت سەرسام بیت لە ڕێك و پێکییان جگە کەنیزەك، هەمیشە و بەردەوام خوا چاودێری هەموو شتێك دەکات.

[سورة الأحزاب:٥٢]

ئەم هەمی دزانین هەتا خێزانا ئێکێ خەدیجە نەچوو بەر دلۆڤانیا خودێی پێغمبەری چ هەڤژینێ دی نەئینان و ژیێ پێغمبەری مەزن ببوو پشتی مرنا خەدیجایێ ، پێغمبەری ئەو هەڤژینێ ئینای هەمیا بەری هنگی هەمیا جارەکێ یان زێدەتر شوو کردبوو تنێ خاتوو عائیشە نەبیت رازی بوونا خودێی لسەر بیتن ، ئەگەر کەسەکێ شەهوانی با ژ تەمەنێ گەنجاتییێ دا هەڤژینێ دی ئینیت نەک دەمێ ژیێ وی مەزن دبیتن و دا کچێت جان ئینیت و پتریا وان ئافرەتا ژیێ وان مەزنتر بوو ژ ژیێ پێغمبەری ، ئەگەر کەسەک با یێ شەهوانی با یان حەش ئافرەتا کردبا دا داخازیا سەرکردێت قورەیشا جێبەجێ کەتن کوو هاتنە دەف و گۆتێ هەر کچەکا جان تە بڤێت دێ پێشکێشی تە کەین بتنێ دەستا ل ڤی کارەی بەردە و دێ تە کەینە سەرکردێ خۆ یێ ئێکێ بەلێ ئەو رازی نەبوو.

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ل ڤێرە دیاردبیت کوو وی بۆ شەهواتێ نەبووە و کەسەک نەبووە حەش ئافرەتا کربیت ژبەر هندێ ئەڤ ژمارە ئینابیت ، بەلێ ل ڤێرە پرسیار دهێتە کرن ئەگەر ئەڤە هۆکار نەبیتن باشە بۆچی ئەڤ ژمارا هەڤژینا هەبوویە ؟؟ بلا بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەینەڤە .

پێغمبەرێ خودێی دەمێ بانگەوازی دکرد بۆ پتریا زەلاما دکرد و ئەو فێری دینی دکرن و زەلام شارزای دینی دبوون ژ دەف پێغمبەری ژ هەمی بوارێت ئیسلامێ ، بەلێ ئافرەت نەدشیان فێری دینی ببن وەکی زەلاما و پێغمبەرێ خودێی نەدشیا هەمی بابەتا دگەل ئافرەتێ بەحس بکەت یان بۆوان باخڤیت وەکی چەوا بۆ زەلاما دئاخفت ، ئەم هەمی دزانین زەلام نەشێت هەمی بابەتا دگەل ئافرەتێ گەنگەشە بکەین و وانا فێری وی بابەتی بکەین ، بتایبەتی ئەگەر کەسەکێ نزیکی ئافرەتێ نەبیتن ، ل ڤێرە چ بهێت کرن باشە ؟ دڤێت هندەک ئافرەت هەبن دینی ژ پێغبەرێ خودێی فێرببن و پتی هنگی ئەو ئافرەت بێژنە ئافرەتێت دەوروبەرێ خۆ دا شارزای هەمی بوارێت ئیسلامێ ببن بڤی شێوەی ئافرەت ژی فێری دینێ ئیسلامێ بوون ژ پێغمبەری

پێغمبەرێ خودێی ژبەر هندێ ئەڤ هەڤژینە ئینان داکوو ئەوانا فێری دینی بکەت و ئەوژی ببن ب ئافرەتێ بانگخواز و دینی بگەهینن ئافرەتێن دی و شارزای دینی ببن ئەڤە ئامانجا سەرەکی بوو کوو پێغمبەری ئەڤ ژمارا هەڤژینا ئینان و وەک هەمی دزانین رێژەکا زۆرا فەرموودا ژ خاتوو عائیشایێ یێ گوهـ لێ بووی کوو نوکە د کتێبێت فەرموودا هەنە ، ل ڤێرە ئافرەت بوو بانگخواز د ئیسلامێ دا .

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

ئەڤا من گۆتی تنێ هۆکارەک بوو دبیت هۆکارێن دیژی هەبووبن یێت کۆمەلایەتی و سیاسی بەلێ ئەڤ چەندە بەسە کوو چ گومان لسەر پێغمبەری صل الله علیه وسلم نەمینن

**مەریەمێ گۆت نائاخڤم:**

گومانەک دیت کو دگوت لدیڤ ڤێ ئایەتا لخوارێ بت مەریەمێ یا گوتی نائاخڤم د دەمەکێ دا پاشێ یا ئاخفتی سورەتا مەریەم ئایەتا ٢٦ خودایێ مەزن دبێژیت :

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا ۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا [٢٦]

ئەڤجا( ژ ڤێ خورمی)بخۆ و (ژ ڤێ ئاڤێ) ڤەخوو دل گەش بە ئەڤجا ئەگەر تە کەسەک دیت(پرسیارا ڤی زاروکی ژتە کر) ب (ئیشارەتا) بێژێ ب راستی من نەئاخفتن لسەر خوو نەزر کریە بو (خودایێ) دلوڤان ژبەر هندێ ئەڤروو دگەل کەسەکێ نائاخڤم

د ئایەتێ دا دیارە بحسی داهاتی دکەت نەک ڤی دەمی...

ئەگەر سحکەین ئایەتین دیڤ وێ دا دێ زانین ئەوبحسێ وی دەمی دکت کو دەمێ مەریەم علیه سلام د چیتە ناڤ قەومێ خوو نەک ئەو دەمێ ل وێرێ

فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا[٢٧]

ئەڤجا دگەل وی زاروکی  هاتە دەف کەس و کارێن خو ئەو (زاروک)ب هەمبێزا خوڤە گرتبوو(خزمێن وێ)گوتی ئەی مەریەم ژ راست تە تشتەکێ زوور خراپ و هەتک بەر یێ کری.

يَٰأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِياًّ.[٢٨]

ئەی ئەوا وەک خوشکا هاروونی(د تەقوایێ و خودا ناسیێ دا) نە بابێ تە زالامەکێ خراب و دەهمەن پیس بویە و نە دایکا تە دەهمەن پیس و زنا کار بویە

فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا [٢٩]

ئەڤجا (مەریەم) ئیشارەت بوو وی (زاروکی) دا (خزمێن وێ) گوت

چاوا دگەل زاروکەکێ باخڤین کو د ناڤ پێچکا خو دایە.

ل ڤێرێ دیاردبیت کو ب ئیشارەت بویە نەک ئاخفتن، ژبەر هندێ گومانێن بێ دینا د وێرێ دایە کو شارازاییێن قورئان و شارازاییێن زمانێ عەرەبیێ نینن یان دڤێت بتنێ خەلکی چەواشە بکەن

## ئەرێ ئیمام عسمانی د ئێک رکعەت هەمی قورئان خواندیە :

دەست پێکێ قورئان خویندن بۆ ئێکی شارزا بیت د عەرەبیێ و ژبەر کربیت دێ سەریعتر خوینیت ژ وی کەسی یێ قورئان ژبەر نەبیت یان عەربی زان نەبی، ئیمام عوسمان ژی شارزای عەرەبیێ بوو و قورئان ژبەر بوو ژبەر هندێ دشیا سەریح بخوینیت ڤە بۆ نموونە سەحکە ڤی گەنجی چ ب لەزی ڤەدخوینیت

https://youtu.be/7KC1UjLPXSw

خالەک دی دیڤ هەمی ژێدەرا ئەو رکعەت ویتر بوویە و ل هەمی ژێدەرادبێژیت ئێک رکعەت وتنێ ویتر ئێک رکعەتە، ژبەر هندێ ویتر چەند درێژبیت د ئیسلامێ رێگەیا پێ هاتی دان، و لدیڤ هەمی ژێدەرا بەحسدکەت کو دبێژیت وێ شەڤێ تنێ ئەو رکعەت یا کری و چ نڤێژێ دی نەکرینە، ئانکۆ ب درێژاهیا شەڤێ ئەو مژیلی وێ رکعەتێ بوویە، و شەڤێ زستانا درێژن حسابکە هەر ژ ٧ شەڤێ تا ٥ سپێدێ دکەت دەهـ سعەت، ئەرێ ب کێمتر ژ وان سعەتاژی نەشێت بخوینیت ؟ بتایبەتی بۆ کەسکێ عەرەبی زان ؟ و شەڤێ هەمیێ تنێ ئێک نڤێژ کربیت ؟

چ نەلۆژیکی تێدایە، بەلێ ئەم دیڤ لەشێ خۆ و خاندنا خۆ بچینیێ کو لەشەکێ لاواز مە یێ هەی و خاندنا مە باش نیە و قورئان مە ژبەر نەبیت دێ بۆمە زەحمەت بیت!!

ژێدەر : http://feqhweb.com/vb/t22397.html

## دابەزینا عیسا علیه سلام

ئەم هەمی دزانین فەرموودە بەشەکێ دینیە و ب بەلگێن قورئانێ بەلێ ئەڤە بابەتەکێ جودایە و من بەری نوکە یا بلاڤ کری کا بۆچی فەرموودە بەشەکێ دینیە ، بلا بهێین سەر ئەسلێ بابەتی ...

ئەڤرۆ چەند موسلمانەکیێ دەرکەفتین و دبێژن مە باوری ب چ حەدیسا نینە و ئەم باور ناکەین کوو عیسا علیه سلام دێ زڤریت و دابەزیتە سەر عەردی ئەم دێ بێژین راستە چەندین حەدیسێ صەحیح یێ هەین لسەر دابەزینا وی بەلێ ئەم بەحسێ حەدیسا ناکەین و دێ چین سەحکەینە قورئانێ کا ئەوژی دبێژیت عیسا علیه سلام دێ زڤریت دا چ بەهانە بۆ هەوە نەمینن ..

خالا ئێکێ خودایێ مەزن دبێژیت ل ئایەتا ٤٦ ال عمران : وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ الصَّالِحِينَ ( ٤٦ ) ئانکو دێ دگەل خەلکی ئاخڤیت دەمێ زارۆک و دەمێ مەزن دبیت .

پەیڤا کهل ل زمانێ عەرەبی بۆ سەرڤەی ٣٠ سالیێ یە ئانکۆ بۆ ٤٠ ٥٠ سالیێ دهێت و ئەم هەمی دزانین ل ٣٣ سالیێ عیسا علیه سلام یێ هەلکێشای بۆ ئەسماناو بزارۆکینی یێ دگەل خەلکی ئاخفتی هەر وەکی ل ئایەتا ٣٠ سورەتا مریم دا هاتی و دبێژیت ( قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) عیسای ئەوێ هێشتا د ناڤ پێچکێ دا گۆت: هندی ئەزم ئەز بەنییێ خودێ مە، وی ئەمر یێ دای کیتابێ بدەتە من، کو ئنجیلە، ووی ئەزێ کریمە پێغەمبەر.

پرسیار ل ڤێرە ئەوە چ حیکمەت تێدایە خودێ دبێژیت دەمێ مەزن دبیت دێ دگەل خەلکی ئاخڤیت ؟ بەرسف بلا بۆ هەوە بیت .

**بەرسڤا گومانێت بێ دينيێ**

خالا دووێ : خودايێ مەزن ل ئايەتا ١٥٩ سورەتا النساء دبێژيت ( وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا (١٥٩) وپشتی هاتنە خوارا عیسای ل دویماهییا زەمانی کەسەك ژ خودانێن كیتابێ نامينت ئەگەر بەری مرنا وی سلاڤ لێ بن باوەرییێ پێ نەئينت، ورۆژا ڕابوونێ عیسا سلاڤ لێ بن دێ ل سەر وان شاهد بت يێن درەو پێ كری، وییێن باوەری پێ ئينای.

سەحكەنێ ئەم هەمی دزانين اهل کيتان مەسحی و جوهی نە و خودێ دبێژيت بەری مرنا عيسا عليە سلام هەمی دێ باوريێ پێ ئينن ، پرسيار ئەوە ئەرێ ل وی سەردەمێ بەری نوکە هەمی کەسا باوری ب عيسا عيلە سلام ئينابوو ل وی سەردەمی ؟ تەبعەن نەخێر ێ ئەگەر نەزڤريت چەوا دێ ئەڤ ئايەتا راست بيتن ؟ و چ گرنگی تێدايە خودێ بێژيتن بەری مرنا وی دێ اهل کيتاب باوريێ پێ ئينن ؟ ل ڤێرە ديار دبيت کوو ئەو عيسا عليە سلام دێ بانگەشا ئيسلامەتيێ کەت و اهل کيتاب هەمی دێ باوريێ پێ ئينن .

خالا سێيێ : خودايێ مەزن ل ئايەتا ٦١ ل سورەتا الزخرف دبێژيت ( وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ (٦١) وهندی هاتنە خوارا عيسايە -سلاڤ لێ بن- بەری ڕۆژا قيامەتێ نيشانا نێزيكبوونا هاتنا قيامەتێيە، ڤێجا هوين ب گومان نەكەڤن كو ئەو دێ چێ بت، ودويكەفتنا من بكەن د وی تشتی دا يێ ئەز بۆ هەوە ژ خودێ ڤەدگوهێزم، ئەڤە ڕێكەكا ڕاستە بۆ بەحەشتێ، يا بێ چەپ وچويرە.

ل ڤێرە ديار دبيت ئێک ژ نيشانێت ئاخيرەتا زەمانی ئەوە عيسا عليە سلام يێ شارزا بيت ل زمانێ عەرەبيێ دزانيت ئەگەر کەسرە ل ژێر علم بوو دبيتە زانست و زانين و يێ باور نەكەت ئەڤ ئايەتە بەحسێ عيسا عليە سلاميە بلا بزڤريت ئايەتێ پێشتر يێ وێ سورەتێ ٥٥......٦٠

**بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ**

خالا چارێ : خودایێ مەزن ل ئایەتێ ١٥٧ ١٥٨ ١٥٩ ل سورەتا النساء بەحسێ ڤێ رودانێ دکەت و دبێژیت : وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا (١٥٧) و ژ بەر وێ گۆتنا وان ب ترانەکرن ڤە گۆتی: کو مە عیسایێ مەسیح کوڕێ مەریەمێ پێغەمبەرێ خودێ یێ کوشتی، ووان عیسا نەکوشتییە ونەهلاویستییە، بەلکی وان زەلامەکێ وەکی وی هلاویست بوو یا ژ وان ڤە ئەو عیسایە. وئەوێن دبێژن: مە یێ کوشتی، ژ جوهییان، وئەوێن ئەو تەسلیم کری ژ فەلان، ئەو هەمی د دەرحەقا وی دا ب گومان وحێبەتینە، ژ بلی دویکەفتنا هندەك هزران چو زانین ل نك وان نینە، وئەو د کوشتنا وی دا دپشت ڕاست نینن، بەلکی ب گومانن.

بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا (١٥٨) بەلکی خودێ عیسا ب لەش ورح وزێندی ب نك خۆ ڤە یێ بلندکری، وئەو ژ کافران یێ پاقژکری، وخودێ د ملکێ خۆ دا یێ زال بوویە، و د کار وڕێڤەبرنێ دا یێ کاربنەجهـ بوویە.

وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا (١٥٩) وپشتی هاتنە خوارا عیسای ل دویماهییا زەمانی کەسەك ژ خودانێن کیتابێ نامینت ئەگەر بەری مرنا وی سلاڤ لێ بن باوەرییێ پێ نەئینت، وڕۆژا ڕابوونێ عیسا سلاڤ لێ بن دێ ل سەر وان شاهد بت یێن درەو پێ کری، وییێن باوەری پێ ئینای.

پێدڤی شلۆڤەکرنێ ناکەت و ئایەت وازحن ، ئەز نزانم چەوا بناڤ موسلمان ئینکارا ڤێ رودانێ دکەن و باور ب هندەک فێلبازا دکەن بەلێ ئەڤ تشتە لدەف هەوە سەیر نەبیت چونکی ئاخفتنەکا ئیمام عمری یا هەی راست بۆ وان یا گۆتی و دبێژیت ( ـ وقد روى عبد الرزاق بإسناد حسن عن ابن عباس

**بەرسڤا گومانێت بێ دينيێ**

رضي الله عنهما قال : سمعت عمر بن الخطاب رضي الله عنه يقول : " إنه سيخرج بعدكم قوم يكذبون بالرجم ويكذبون بالدجال ويكذبون بالحوض ويكذبون بعذاب القبر ويكذبون بقوم يخرجون من النار / كتاب اتحاف الجماعة بما جاء في الفتن و الملاحم واشراط الساعة.

ئانكۆ قەومەكدێ ئێت دێ بێژن دجال و عزابا قەبری و ..... چنەدين تشتێ دی درەوە ، ئەڤ ئاخفتنە ب تەمامی وان كەسا ڤەدگريت .

ل دوماهيێ پرسيارەكا لۆژيكی باشە بۆچی لدەف قەبرێ پێغمبەری سلاڤێت خودێ لێبن جهێ كەسەكی مایە ؟ ئەم هەمی دزانين خێزانا وی گۆتە ئيمام عمری بلا تە ل وێرێ ڤەشێرن بەلێ گەلەک حەسكر ئەو ل وێرێ با و حەتا وی رادەی گۆت ئەگەر امام عمر نەبا من نەددا كەسێ ، ئەرێ بۆچی وێرێ بەتال هێلا ؟ ئەگەر بۆ عيسا عليه سلام نەبووبيت كوو ل ئاخير زەمان دێ ل نک پێغمبەری ڤەشێرن .

يامن دڤێت موسلمان ژ ڤان فێلبازا باورنەكەن و موسلمان ديڤچونا بابەتا بكەن و ئيسلاما مەزن بۆ ديار ببيت .

# والحمدلله رب العالمين

## بەرسڤا گومانێت بێ دینیێ

